# مناجات

دووەم تەرجیح بەندی خواناسی .

ئەو کیباران لە سەر ئەفلاکن
کە لەرێی ئاشنایی یاخاکن
ئەو رەسوولانە واقیفی سڕ بوون
مەوریدی واریداتی (لولاک) ن
ئەو گەدایانە وێڵ و مەجنوونن
وەکوو لەیلاکە شۆخ وبێ باکن
ئەو بڵند هیممەتانی دنیایی
کە دەبەخشن کە چی بە ئیمساکن
تاجدار و قەلەندەر و دەروێش
کە عەلەمداری داری مەششاکن
ئەو عیبادەی لە کونجی وەحدەتدا
کە بە شوهرەت لە عالەما تاکن
ئەو ئەدیبانە مەوجیدی ئەدەبن
کە لە ئەهلی تەمیز و ئیدراکن
یا خسووس ئەو خودا پیاوانەی
مولهیمی ( نعبد ) و (ایاک )ن
پڕ دەم و پڕ زوبان و دڵیانە
هەموو بەم زیکرەوە فەرەحناکن
لە ئەزەل تا ئەبەد، خوا خوایە
جیلوەیەکە کە پڕ دوودنیایە
یا ئیلاهی بە قەدری تۆ بێ شک
( ما عرفناک حق معرفتک )

بەناوی خوا



# نێوەرۆک



فێرگە
دیاری خالید قەلعەکوهی

# ● سەروتار ●

خوێنەرانی بەرێز سڵاوتان لێ بێ. ساخی و سلامەتی و سەرکەوتنی هەموو ئێوە ئازیزان داواکارین . بە یارمەتیتان باسی ئەم ژمارە دەست پێدەکەین .

حەتمەن لەبیرتانە کە ژمارەی پێشوو سەبارەت بە کەموکووڕی وکەمایەسی یەکانی سروە وەک ماوەی دەرچوون و مانگانە بوونی سروە کورتە باسێکمان پێشکەش کردن وگەیشتینە سەر باسی پێوەندی نێوان ئێمەوئێوە. هێندێکیش لەسەر ئەو باسە دواین وئێستا بە پێی بەڵێنی باسەکە درێژە دەدەین .

ئێمە وئێوە....

دۆستە خۆشەویستەکان ! حەول ودەولی بەڕێوەبەران بۆ خزمەت بە فەرهەنگ و خەڵکی باش و بەشەرەفمان بەتایبەتی دڵبەندانی سروە پێوەندی بەرادەی هاوکاری و پشتیوانی ئێوەوە هەیەو هیچ شک لەوەدا نیە .بەستە بەوەیە کە ئێوە تاچ رادە —

یەک چارەنووسی ئەم جیهادە پیرۆزەتان بەلاوە گرینگە کە بۆ سرینەوەی ژەنگ و ژواری نەزانین وژیانەوە و رازانەوەی فەرهەنگی رەسەن و ساماندراری خۆمان دەست پێکراوە ؟ یا بۆ بردنە سەری رادەی چەندوچۆنی کارەکە وخوڵقاندنی شوێنەواری پڕبایەخ و هەرمانی باسکی هیممەتتان هەڵکردووە و یاریدەی دەدەن. بە کوردی چەند بۆبەردەوامی پێوەندی نزیکی خۆتان لەگەڵ ئەم ناوەندە گەڵاڵە و پێشنیار و رەخنە وهەڵسەنگاندنی کارە کراوەکان خۆتان بە دەرووەست وبەرپرس دەزانن ، تا تەواو بنە بنەما و هەوێنی شێواز ورادەی کار و تێکۆشان .

بۆ پێک هاتنی هەل و مەرجی ئیدەئال بەر لە هەمووشت دەبێ بۆ پتەوتر بوون وبەردەوامتر بوونی پێوەندی خۆتان حەول بدەن . ئەم پێوەندی یە دەبێ دوو لایەنە بێ. ئێمە تا ئێستا بە سازکردن وپێک هێنانی موسابەقەی عیلمی ووت وویژ و بەرێوەبردنی کۆنگرەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و بەرێوەکردنی جوابی ئەو خوشک وبرایانەی نامەیان بۆ ناردووین تێکۆشاوین ئەم پێوەندی یە پتەوتر بکەین ولەم کارە بەهرە وەربگرین و هەروەک لە ژمارەی پێشوودا رامانگە ـ یاند بەرهەم و ئاکامێکی باشیشمان لێ وەرگرتووە.

ئەم کارە بە گشتی توانیویەتی پشتیوانیێکی بەمەتمانە وبەقای داهاتوومان بێ وهیوای داڕشتنی گەڵاڵەی درێژخایەنی لە دڵدا زۆرتر کردووین. بەڵام ئەگەر بمانەوێ سەبارەت بەئەرکی سەرشانی خۆمان بەرپرستر بین بۆمان روون دەبێتەوە کە قەت ناتوانین بەوەندە بەرهەمە بڵێین ئیدەئال.

هەرچەندە ئەو نامانەی ئەم سەروبەندە بەدەستمان گەیون ئەوەندە زۆرن کە زۆربەی وەخت و سەعاتی ئێمەی بەخۆ تەرخان کردووە دیسانیش بە تێرادیوی و راشکاوی دەڵێین نامە پڕ هەست وئەوین و خۆشەویستی ئێوە دڵبەندان بۆ ئێمە زۆر گرینگ و پڕ بایەخە و پێمان خۆشە بارستیان جار لەگەڵ جار پتر بێ .

ئەوە گونجاوترین شێوەی پێوەندی ئێمەیە وسەرەتایەکە بۆ دەست پێکردنی هاوکاری هەراوتر و بەکەڵکتر لە داهاتوودا .

ئێمە دەبێ لەوەئاگادار بین کە دۆستان سروە بە هەموو بارو بابەتەکەیەوە چۆن دەبینن و بۆ بڵاو بوونەوەی سروەی جوانتر و رێک وپێکتر و رازاوەتر پێشنیاریان چیە؟ چون بۆ ئێمە زۆر گرینگە .

ئێوە ئەوە دەسەلمێنن بەرجی ئەمە کە شانازی بە جیاوازی چین وتوێژ ورادەی خوێندن وتەمەنی خوێنەرا ـ نمان دەکەین ، لەباری هەڵبژاردن و گونجاندنی بابەتی دڵخوازی هەموو چین وتوێژێک تووشی کۆسپ وگرفتێکی بەرچاوی کردووین بۆیە ئێمە دەڵێین نەزەرو را و بۆچوونی ئێوە خۆشەویستان کەرەسەی ئەم خزمەتە گەورەیە. پێش درێژەدانی باسەکە پێویستە بۆ ئەم دۆست وبرایانەی یارمەتی یان داوین و تا ئێستا بە نووسین وناردنی پێشنیار ورەخنەی بەجێ ئێمەیان لە کەمایەسی یەکان ئاگادار کردووە، بەتایبەت ئەوانە کە ئاسەواری رەخنەی خۆیان لە سروەدا نەدیوە کورتە باسێک پێشکەش بکەین وهێندێکیان قسە لەگەڵ بکەین

دۆستانی ئازیز ! بێ شک ئێوە دڵبەندانی سروە دەتانەوێ ئەم گۆوارە، جوانتر وپڕنێوەرۆکتر دەرچێ بۆیەش رەخنە وپێشنیاری جوان وبەجێمان بۆ دەنێرن وچاوەروانن لە بەرهەمی ئەوان ئاگادار بین . خۆشەویستان دەبێ پێتان رابگەیەنین کە بیر ورا و

رەخنەکانی ئێوە زۆر بە وردی لەبەرچاو گیراون و تا ئەو جێگەی بۆمان لوابێ بەڕیوەمان بردوون بەڵام ئەوەش دەبێ رابگەیەنین کە سەلیقە ودڵبەندی جۆراوجۆر هەیە وبەڕێوەبردن ولەبەر چاو گرتنی هەموو نەزەریک (کە زۆرجار دژی یەکدین) بەپێی گیروگرفتی بەڕێوە چوونی ئەم ناوەندە و بەربەست بوونی نێو سروە بۆ ئێمە نالوێ. هەموو حەول ودەولمان ئەوەیە کە تا ئەو جێگەی لەدەستمان دێ ئێوە رەزا بن.

ئازیزان! ئێمەش پێمان خۆشە سروە بێ عەیب وکەموکووری بێ وهەموو بابەتی دڵخوازی ئێوەی تێدا بێ و بە دڵی ئێوە دەرچێ بەڵام ئەم کارە پێویستی بەوەخت هەیە. روونە گۆوارێکی حەفتا وچەند لاپەڕەی مانگانە ناتوانێ هەموو مەبەستێکی کۆمەڵایەتی ،سیاسی،فەرهەنگی ئەدەبی ،ئابووری، تاریخی و جوغرافیایی و هونەری و وەرزیشی تێدا بگونجێ ئەویش هەریەک لەوانە بۆخۆی چەند لکی لێ دەبێتەوە و لەگۆوارێکی هەزارلاپەڕەییشدا ناگونجێ. بۆیە پاش موتالا وچاو پێداگێڕان و بیر و رایەکی زۆر هاتووینە سەر ئەم بڕوایە کەچەند تەوەرەی سابت وجێ گۆرکێ پێکراومان بۆ دیاری کردووە تاوێڕای پاراستنی رێبازی فەرهەنگی ئەدەبی باسی مەبەستەکانی دیکە کەخەڵک پێیان خۆشە بکەین وهۆی رەزامەندی بەشێکی هەراوتر لە خوێنەرانی بەرێز پێک بێنین.

ئەڵبەت ئەم باسە پتری لێکۆڵینەوە دەوێ و وردە، باسەکانی بۆ داهاتوو هەڵدەگرین.

لە کۆتاییدا رادەگە- یەنین کە بۆپێک هێنانی پێوەندی پتر و نزیکتری نێوان ناوەند و خەڵک (بەتایبەتی خوێنەرانی بەرێز) گەلاڵە گەلێکمان بەدەستەوە کە لە ژمارەی داهاتوودا لەسەری دەرۆین.

خوا یار بێ.

"خوا ئاگادارتان بێ"

دەستەی نووسەرانی

"سروە"

## سر مقاله

بسمه تعالی

با سلام به خوانندگان ارجمند وبا دعای سلامتی وتوفیق برای یکایک شما عزیزان بحث این شماره را آغاز میکنیم. حتما "بیاد دارید که درشماره گذشته درباره اختلالات بوجودآمده درزمان انتشار و توزیع وهمچنین مسئله ماهانه شدن "سروه" توضیحاتی را باطلاع علاقمندان رسانده و آنگاه بحث به یکی از مسائل مهم واساسی یعنی چگونگی ارتباط بین ما و شما رسید ودراین بارەنیز مطلبی گفته شد. اکنون بنا به وعده‌ای که داده بودیم این بحث‌را پی میگیریم.

ما وشما

دوستان گرامی! تلاش همه دست اندرکاران برای خدمت بەفرهنگ ومردم شریف وخوبمان وبویژه دوستداران "سروه" بی هیچ تردیدی به میزان ارتباط وهمکاری و پشتیبانی شما بستگی دارد. اینکه شما تا چه حد به سرنوشت این جهاد مقدس‌که برای زدودن غبار جهل و ناآگاهی واحیاء وپیرایش فرهنگ غنی واصیلمان آغاز شده، علاقمند باشید؟ اینکه شما تا چه میزان برای ارتقاء کیفی و کمّی کار وخلق آثار ارزنده وماندنی خود را حاضر بەمساعدت نمائید؟ وخلاصه اینکه شما تا چه اندازه در برقراری ارتباط مستمر ونزدیک با

بڕوانە لاپەڕەی ٥٢

# فەقێیەتی

م.س.ئیبراهیمی

بۆئەوەی کە داب و رەسمی کۆنی حوجرە وفەقێیەتی لەبیر نەچێتەوە وگەردی فەراموشی نەکەوێتە سەر، بەوردی ، باسی لێدەکەین .

**چینەکانی عیلمی وخوێندەوارانی حوجرە چوارن :**

ئەووەڵ: مامۆستای گەورە کە دەرس دەڵێتەوە• هەمیشە عینوانی مەلا کە گەورەترین پلە ومەقامی ئەو کۆرەیە دوای وشەی مامۆستا دێ بۆ وێنەمامۆستا مەلا محەممەد.

دووهەم: موستەعید کە لەپێش ناوی ئەوان وشەی مەلا دێ بۆ وێنە مەلا رەحیم.

سێهەم: سوختە کەزیاتر بەناوی خۆی بانگی دەکەن و جارجاریش مەلای پێ دەڵێن .

چوارەم: قوتابی .

بەتێکرایی جگە لە مامۆستا بەو سێ دەستەی دیکە دەڵێن فەقێ .

**مامۆستا و ئەرکی ئەو:**

مامۆستا دەبێ ئەستێرەی گەشی ئاسمانی عیلم وئەدەب بێ ولە زەوی و زاری زانیاری ودینداریدا یەکە جووتیار بێ ومەلی خەیاڵی هەڵۆیەک بێ بۆ دۆزینەوەی نوکاتی عیلمی .

مامۆستا دەبێ هەمیشە ئامادە بێ بۆ دەرس دان بەموستەعیدەکان ولەوەزعی دەرس فێربوون وحاڵی بوون وخوێندنی فەقێکان ئاگادار بێ وهانیان بدا بۆ پێشکەوت لە دەرسەکانداوولامی پرسیارەکانیان بداتەوە وبەکورتی وەک بابێکی دلسۆز ئاگای لە ژین وپێداویستی یەکانی ئەوان بێ .

**شێوەی دەرس دانی مامۆستا :**

مامۆستا هەموو شەو دەبێ تەواوی ئەو کتێبانەی سبەینێ بەموستەعیدەکانی دەڵێ موتالای بکا وئامادە بێ بۆ دەرس دان ورۆژی دوایی دوای نوێژی بەیانی ونان وچا خواردن پێویستە بچێ بۆ حوجرەکەی خۆی. موستەعیدەکان بەپێی پلەی زانست ونۆرەی دەرس دەچنە لای مامۆستا و زۆر بەئەدەب وئیحترام لە خوارەوەی مامۆستا چۆک دادەدەن و مامۆستا دەڵێ : ( بارک اللەفی جمیع مقاصدک)موستەعیدیش لە وڵامی دا دەڵێ:(ایاناوایاک الرحمە ) ومامۆستا دەرس تەقریر دەکاوموستەعیدیش جوان گوێ رادەگرێ ولە هەرکوێ حاڵی

بوو دەڵێ: بەڵێ قوربان وئەگەر حاڵی نەبوو دەیپرسێتەوە ومامۆستا ش بۆی شێ دەکاتەوە. کاتێک چاک حاڵی بوو دەرسەکەی تەواو بوو فەقێ دەڵێ:( رحمەاللە علیک) مامۆستاش لە وڵامدا دەڵێ:(علینا وعلیک الرحمە) فەقێ لەخزمەتی مەرەخەس دەبێ .

بەڵام جاری واش هەیە موستەعیدەکان هەموویان لەدەوری مامۆستا دادەنیشن و کتێب لەبەر دەستی خۆیان دادەنێن و روو دەکەنە مامۆستا وئەویش دەرسیان دەدا جا رەنگە ئەو دەرسە تایبەتی موستەعیدێک بێ وئەوانی دی هاتبن بۆ گوێ راگرتن وفێربوون یادەرسی هەموویان بێ. موستەعید دەتوانێ هەموو جۆرە پرسیارێک لە مامۆستا بکا وئەویش لە ئەستۆیەتی وڵامی دروستیان بداتەوە.

**بژیو وکار وبەڕێوەچوونی مامۆستا :**

مامۆستا پوڵێک بابەتی دەرس دان ، وەرناگرێ ودەبێ خۆی لەفکری بژیوی خۆیدا بێ. زۆربەی مامۆستایانی وڵاتی ئێمە لەرێی ئاژەڵداری وکشت و کاڵ ماڵ و منداڵیان بەخێو دەکەن هەڵبەت لە یارمەتی وپشتیوانی پیاوچاکان و دینداران بەرخوردارن ولەهێندێک شوێن لە ماڵی مەوقووفە بەشیان هەیە وکەڵکی لێوەردەگرن .

**موستەعید وئەرکی سەرشانی :**

موستەعید بەکەسێک دەڵێن کە بەلانی کەمەوە دەستی بەخوێندنی کتێبی جامی یا سیوتی کردبێ. موستەعید دەبێ هەموو رۆژێ دەرسی خۆی لەبەر بکا، دەرسێک کە سبەینێ دەیخوێنێ دەبێ شەوێ بە سەرنجەوە موتالای بکا بەو جۆرەی کە بەتەواوی بۆ سبەینێ ئامادە بێ و ئەو خاڵانەی لەلای گرینگە وبۆی لێک نادرێتەوە دیاری بکا وبە هوشیارێکی زۆرەوە دەبێ گوێ بەزەنگ بێ بزانێ مامۆستا چۆنی مانا دەکا فێری بێ وئەگەر لازم بوو لێی بکۆڵێتەوە و دوای ئەوە دەرسەکەی خوێند و بە باشی لێی حاڵی بوودەچێتە جێگەیەکی ئارام دەوری دەکاتەوە و یا لەگەڵ فەقێ یەکی دیکە بەوردی سەرنجی دەدەنێ و لێکی دەپرسنەوە و دەیدەنە بەر زەینی خۆیان .

ئەرکی دیکەی موستەعید کە بەباشی بەرێوەی دەبەن دەرس دانی سوختەکانە کە ئەو کارە دەبێتە هۆی لەبیرنەچوو — نەوەی دەرسەکانی رابردووی موستەعید.

موستەعید هەروەکوو مودیری مەدرەسەیە کە دەتوانێ هەرجۆرە تەمایەک بگرێ .

**سوختە و ئەرکی ئەو :**

سوختە بە فەقێ یەک دەڵێن کە دێتە نێو حوجرە ولە تەسریفی زەنجانی و عەوامیلەوە تا کتێبی جامی و سیوتی لەلای موستەعید دەخوێنێ. بەرنامەی دەرسی یان لە تەسریفی زەنجانی یەوە دەست پێدەکا. سوختە دەبێ لانی کەم تا فەسڵی موزاعەف ئەو جۆرەی کە ئوستاد تەدریسی دەکا بیڵێتەوە یانی یەکێک لە موستەعیدەکان کە دەرس بە سوختە دەڵێ کتێبەکە بەدەستەوە دەگرێ و سوختەش گوێ رادەگرێ بێ ئەوەی چاو لە کتێب بکا بەزەینی دەسپێرێ. دوای ئەوە کە گەیشتە فەسڵی موزاعەف سوختە ئیتر رادێ ودەتوانێ لەرووی کتێبەوە دەرسەکە فێر بێ وبیخوێنێ. لە دواییدا ئەو کتێبانەی پێویستن دەیان خوێنێ تا جامی و سیوتی کە گەیشتە ئەو پلە دەبێتە موستەعید وجێی رێز وئیحتیرامی تایبەتن کاروباری حوجرە پاک وخاوێنی، نان و چێشت سازکردن وسەماوەر تێ خستن هەمووی لەژێر چاوەدێری موستەعید لەسەر شانی سوختەیە.

قوتابی بەو منداڵانە دەڵێن کە تەمەنیان هەر شەش حەوت ساڵ دەبێ و تازە دەست پێدەکەن. ئەلف وبێ و چەند کتێبی وەک ناگەهان ،گوڵستان و ئەحمەدی و.... لە قوتابخانە فێر دەبن. هەڵبەت قوتابخانە لەو دێ یانەیە کە مەلای مودەریسی لێ نیە یانی لە گوندێک کە میرزا و مەلایەک هەیە کە لە مزگەوت یا لە ماڵێک خوێندنی سەرەتایی فێری منداڵان دەکەن بەڵام ئەگەر ئەو گوندە مەلای مودەریسی لێ بوو سوختەکان ئەرکی فێرکردنی قوتابی یان لەسەرشانە ولەبەر هەیوان یا لە مزگەوت دێنەلای سوختەکان ودەرس دەخوێنن.جێگای نوستن وخواردنیان ماڵە باب وخزم وکەسیانە و قوتابی ئەو وەختە دەتوانێ بێتە حوجرە کە بگاتە پلەی سوختەیی .

قوتابی دەرسی خۆی لەپێشدا بەنێوی یافتاح فتحم بدە- یا رزاق رزقم بدە یا اللە تۆفیقم بدە وبسم اللە الرحمن الرحیم دەست پێدەکا . ئەلف وبێ وقورئان هەتا سوورەی (عم) بەحینجەوە دەخوێنێ . دوایەش قەرائەتی قورئان هەتا ئاخر دەخوێنێ و وێرای خوێندنی قورئان کتێبی سەرەتایی کوردی وفارسی وەک کتێبی ئەحمەدی نووسراوی خوالێخوشبوو شێخ مارفی نۆدهی وکتێبی «نصاب الصبیان» نووسراوی ئەبوونەسرفارابی و هەروەها رێ وشوێنی نوێژکردن و تاعەت ودین فێر دەبێ . هیندێک قوتابی تەسریفی زەنجانی و عەوامیلی جورجانیش دەخوێنن . ئەگەر ئەوانەیان خوێند دەبنە سوختە .

**بەرێ چوونی فەقێ کان :**

ژیانی خوێندەواران کە بریتی یە لە موستەعید وسوختە لەوپەری ساکاریدا لە لایەن خەڵکەوە دابین دەکرێ چ لە شار و چ لە دێهات زۆر بەقەدروحورمەتەوە ، یارمەتی دەدرێن. سوختەکان دەچن لەو ماڵانەی کە توانایان هەیە نان وخۆراک و قەند وچا وماست وپەنیرو....وەردە - گرن ولە حوجرەدا پێکەوە دەیخۆن ولە هیندێک شوێن لە لایەن مڵک وماڵی مەوقووفەوە خەرجیان دەردێ وجاری واشە فەقێ بەتێکڕایی دەچنە دێهاتی دەوروبەر بۆ (راتبە) یانی یارمەتی وەرگرتن یا زەکاتی گەنم وحەیوان وئەوجۆرە شتانە . وبەو جۆرە ژیانی سادە و ساکاری فەقێ یان دەگوزەرێ .

**وچان دان :**

خوێندەواران جگە لەرۆژی جومعە و جێژنی قوربان و رەمەزان کەتەعتیلن رۆژەکانی دیکە دەبێ لەسەر کلاس حازر بن یانی شەوو رۆژ کاری ئەوان خوێندن وموتالای کتێبە ونابێ وەختی خۆیان بەفیرۆ بدەن. بەڵام رۆژی وچان داندەرس ناخوێنن ودەچنە سەیران وگەڕان و...

شەوو رۆژی تەعتیلیش زیافەتێکی ساز دەکەن ودوای نان خواردن و نوێژ کردن لەو فەقێ یانەی دەنگی خۆشە قەسیدەی، (بوردە) دەخوێنێتەوە وئەوانی دیکەش بەدەنگی بڵیند و مەوزوون جوابی دەدەنەوە یا بە گێڕانەوەی قسەی خۆش و نەستەق و شیعر خوێندنەوە ئەوشەوە خۆش رادەبوێرن .

**چینایەتی :**

شایانی باسە لە کۆڕی فەقێ یاندا کەس لەکەس سەرتر وبەرەژوورتر نیە کوڕی ئاغا وشوان وگاوان و دەوڵەمەند و فەقیر هەر بەچاوێک چاو لێدەکرێ و لە یەک بارودۆخ دان وتەنیا ئیعتبارێکی هەیانە لەباری پلەوپایەی زانین و عیلمەوەیە یانی هەرکەس زیاتری خوێندبێ جێی رێز وئیحتیرامە و وەپێش دەکەوێ و لە لای سەروو دادەنیشێ و ئەو داب و

رەسمە زۆر باش بەرێوە دەچێ و بۆتە هۆی سەقامگیربوون و رێزدانان بۆعیلم و زانست ؟ هاندانی فەقێ بۆباشترخوێندن .

**ئیجازەنامە :**

کەسێک دەتوانێ ئیجازەنامە وەرگرێ کە سێ دەورەی قوتابی ، سوختەیی و موستەعیدی تەواو بکا لەو دەورەی سوختە- یيدا دەبێ ئەم کتێبانە بەتەرتیب، بخوێنێ: عوامل جرجانی - انموزج- اظهار تصريف ملا على صمديه- وضع و استعاره شرح جامى - گلستان وبوستان سعدى کليلەودمنە- فتح القريب .

لە دەورەی موستەعیدی دا دەبێ ئەم کتێبانە بخوێنن : سیوطی - شرح نظام یا سيدعبدالله لە سەرف ولەمەنتیق دا ، فناری وتهذيب المنطق علامه تفتازانى وگلنبوی آداب لە عیلمی نەقدو رەخنەدا ولە عیلمی بەلاغەدا مختصر يا مطول ولە عیلمی کەلامدا شرح عقايد نسفى ودووبارە لە مەنتیق دا برهان گلنبوی یاسبزواری ولە عیلمی نجوومدا تشريح الافلاك تاليف شيخ بهايى ولە حیسابدا خلاصه‌الحساب والجبرومقابلە محمد خوارزمى شرح مواقف سیدشريف جرجانى، شرح هداية‌الحكمەحسين ميبدى - شرح تهذيب الكلام شيخ عبدالقا- در مهاجرسنندجى لەعیلمی کەلامدا - اشكال التاسيس شمس‌الدين سمرقندى ولە عیلمی اسطرلاب وربع لبيب کتێبی مەلا گجکەی هەولێر .

عادەت وایە ئەو کتێبانەی ناویان برا لەبەر کرێن . ویرای خویندنی ئەو دەرسانە لەبەرەوە کتێبی "فتح ابلیین" و"منهاج"ی ئیمامنووی و منهاج قاطی زكريا انصاری وبەعزێک تحفەی شيخ ابن حجر لە عیلمی فقەدا دەخوێنن و هەروەها لە عیلمی تەفسیردا " جلالين " و "بیضاوی" دەخوێنن . بەتێکڕایی لەو پلەدا خوێندن و موتالاّ کردنی علوومی باو وەک :ئەدەبیات ، تاریخ ، لۆغەت فقە،حەدیس ،قورئان وتەفسیر، اصول و عەقاید ، علوومی بەلاغە ، فەلسەفە وکەلام ، مەنتیق وحیکمەت،موناز یرە ،شیعر وقەسیدە کوردی وفارسی وعەرەبی، جوغرافیا ،خطابە ، نووسەری،حیساب وهەندەسە ، تەحقیق وحسن خەت عیلمی عەرووز و قافیەیە .

بەکورتی هەتا ئەو جێیەی مەودا هەبێ وبۆیان بگونجێ دەخوێنن، وەدوای خوێندنی ئاخرین مادەی تەحسیلی یانی کتێبی "تهذيب الكلام" جێژنی خەتمی خوێندن دەگیرێ. لەو جێژنەدا گەورەکانی عیلم و مەلاکانی ناوچە وچینەکانی جۆربەجۆری خەڵک بەشداری دەکەن. ئەو جێژنە جاری وایە هەفتەیەک دەخایەنێ....

دوای خواردنی نەهار لە ئاخرین رۆژی تەحسیل دا چەند ئایە لە قورئان دەخوێننەوە و دوایەش قەسیدەی(بوردیە ) بە دەنگێکی خۆش دەخوێننەوە، دوایە مامۆستا بەرێ ورەسمێکی تایبەتی مێزەری سپی و خەرقە لەبەر موستەعیدی فارغ — التحصيل دەکا دوایەش بەتێکڕایی لەخوا دەپاڕێنەوە کە مامۆستای تازە لە کارەکانی دینی ودنیایی دا سەرکەوتوو کا ودوای ئەوە مامۆستا ئیجازەنامەی رەسمی کە بە سیلسیلە مەراتیب دەگاتەوە حەزرەتی رەسوول(د.خ) وجوبرەئیل وحەق تەعالا دەخوێنێتەوە وبەو جۆرە ئیجازەی فتوا و وەعز وتەبلیغ ودەرس دانی پێ دەدرێ ولەدوای ئەوە مامۆستا ماچی دەکا و دوعای بەخێری بۆ دەکا و لەو کاتەدا فەقێ کانی دیکە وئەهلی مەجلیسەکە تێکرا هەڵدەستن ودەچن بۆلای ئەو فەقێ یە و دەستی لەنێو دەستی دەنێن ودوعای بۆدەکەن وخۆیان خۆشحاڵ نیشان دەدەن . و رێ و رەسمەکە تەواو دەبێ .

# وتووێژ: لەگەڵ

# مامۆستا هەژار

## بەشی ٢

- بۆ شیعری نوێ دەلیی چی . دەگەلی چۆنی ؟

- پێوەر ( معیار ) مەعنایە. شیعری تازەی جوانمان هەیە وهی ناحەزیش زۆر. لەپێشدا ئاوڕێک لە شیعری کلاسیک دەدەینەوە. هەزاران شاعیرمان بووە. زەمانی نالی رەنگە دەهەزار شاعیرمان بووبێ . هەر لە شاری سولەیمانی زیاتر لە ٥٠٠ شاعیرمان بوو. چۆن بوو هەموو وەک بڵقی سەر ئاو تێداچوونْ* و هەر یەک مایەوە؟ لەبەر ئەوە کە زۆربەیان شیعری بێ ناوەرۆکیان دەگوت . شتی بێ مانا تێدا دەچێ و نامێنێ. شیعری نوێش ئەگەر لە مانا پرو تەژی نەبێ هەر ئەوەیە تێدا دەچێ. باوەرم پێ بکە شیعرەکانی نیمایووشیج بابی شیعری نوێ هیچی بەکار نایە. با کافر بم!

ئەورۆ باسی عەبدوڵلا پەشێویان دەکرد. شیعرەکانی ئازادن.بەڵام پڕن لە مانا و نێوەرۆکی جوان. شاعیرەو شاعیری چاکە!

- پێت وانیە شیعری نوێ سەرەنجام جێگا بە شیعری کۆن چۆل دەکا ؟ من پێم‌وایە شیعری کۆن بەرەو نەمانە. داهاتووی نیە ؟

- منیش پێم‌وایە.خەڵک بەو بارەدا بایان داوەتەوە، ئاخر دەزانی چیە شیعری نوێ کەم تەکلیف‌تریشە . شاعیرە کۆنەکان ـ لەنێو خۆماندا بێ‌ـ ریشیان لە داوی رەدیف وقافیەدا گیر بوو. رەدیف ساز نەدەبوو. کەلیمە بۆ قافیە دەست نەدەکەوت وهەزار کەم و کووڕی دیکەش. ئێستا ئەو قەیدوبەندە نەماوە. ئێستا گرینگ ئەوەیە شاعیر مانای بەرز وەدەست خا . دیارە "وەزن" دەبێ لەبەر چاو بگیرێ .

- ئێستا کەپێت وایە شیعری نوێ تەنیا رێبازی شیعرە و لە داهاتوودا تاقانەیە. ئەندەرز* و رێنوێنیت بۆ لاوان چیە ؟

- لەپێش هەموو شتێکدا بابەتی جوان لە مێشکدا پەروەردە بکەن. پاشان بە واژە و قالبی جوان بی رازێننەوە.قەدیمی یەکا ـ نیش هەروا بوون. شیعری جوان ئەوە بوو کە ماناو قالب وفۆڕمی لەسەریەک پێکەوە جوان بن. شاعیری وا هەبوون لەخۆوە دەستیان پێدەکرد. مەگەس . عەسەس قەفەس. شتی وایان دەکردە قافیە و لە نیوەی دا، دەوەستان و دەمانەوە !

- لەسەریەک دەفەرمووی شیعری نوێ پێداویستی بە فکر ونێوەرۆکی بەرز و قالبی جوان هەیە ؟

- بەڵێ راستە. ئێستا لەنێو عەرەبان لە سووریا نەزار قەبانی هەیە. بە راستی بە خوێندنەوەی

شیعرەکانی مووم لێ دەبێتە نەشتەرا عەبدوڵڵا پەشێویش سەیرم کار لێدەکا .

- ئەو شیعرە نوێ یانەی لە سروەدان هەست و بیر دەبزێون یان ...؟

- چەند شاعیرێکتان هەن عەلی نانەوازادە لەکەرەج دوو شیعری دامێ زۆرم پێ باش بوون.عەلی حەسەنیانیش لە سروەدا شیعرێکی باشی بوو. دووپاتی دەکەمەوە ئەوەی گرینگ بێ مەعنا و نێوەروکە.

- با هێندێکیش باسی خۆت بکەین . ئەو رۆژانە خەریکی چی ؟ چ دەنووسی ؟ چت بەدەستەوەیە.؟

- هیچ ! خەریکی چەرمەسەرەی رۆژگارم. کوا وەختی خەریک بوون !

- فەرهەنگەکەت بەکوێ گەیاندووە ؟.

- تاپیتی"ت" گەیشتوون.

- زۆر چاوەروانی ئەو فەرهەنگەین. من خۆمدیتوومە ودەزانم ئەگەر دەرچێ، بۆ گەیشتن بەزمانی یەکگرتوو زۆرمان یارمەتی دەدا .

- با بزانین چۆن دەبێ .

- بەڵام کتێبی قانوونی حەکیم ئەبوعەلی سینا.دەمەوێ بزانم بێجگە لەو تەرجومە جوان ورێک وپێکەی خۆت کردووتە، کەسی دیکە وەری گێراوەتەوە یان خێر؟

- کتێبێک هەیە بەناوی "قانوونچە" کە تەرجومەی قانوون نیە. دەبێ بڵێم نەخێر تەرجومە نەکراوە.

- هۆی چیە کتێبی وا گرینگ تا ئێستێ تەرجومە نەکراوە و ئەگەر هەژاری موکریانی نەبا فەرهەنگی فارسی لەو گەنجەبێ وێنەیە بێ بەش دەبوو ؟

- چت جواب دەمەوە . راستت دەوێ کەس نەی وێراوە خۆ لە قەرەی بدا .

ناحەقیان نیە .وەک عەرەبی ناچێ. ناڵێم لە ئێراندا کەس عەرەبی نازانێ. بەڵام ئەوە عەرەبی یەکی ئاسایی نیە. زمانێکی تایبەتە.

ئێران . بەدوای کاردا ، دەگەڕام. لەتەقازانامەکەمدا نووسیبووم عەرەبیش دەزانم، رۆژێک کتێبی قانوونیان پێدام. تا ئەو کاتە هەر ناویشیم نەبیستبوو.پێموابوو باسی قانوون وحقووق دەکا . بردمەوە ماڵ دیتم هیچی تێناگەم. بردمەوە ئیدارە و گوتم کاکە من لەوە حاڵی نابم. من بە ئەدەبیاتی عەرەب شارەزام. دیوانی موتەنەبی و ئەبوو نەواس وشاعیران ونووسەرانی کۆن وتازەی عەرەبدەزانم دوکتۆر فەرەهوەشی گوتی رازیم مانگێ لاپەڕەیەکمان بۆ تەرجومە کەی. ناچار

# لەشیعرەکانم گەڕێ هیچیان باش نین

دەگەڵی خەریک بووم. وردە وردە زبانەکەم کەشف کرد. کەوتمە سەربار. ئێستاش پێموانیە کەس بتوانێ سەری لێ دەرکا. جا با قسەی خۆش ون نەبێ.

رۆژێک ماموستا رۆژ، بەیانی هاتە ماڵی ئێمە. مەلا جەمیلی رۆژبەیانی

شتێکی سەیرە. سەبیلەی شەیتانە! قەدیم منداڵ ئەگەر شتێکیان بدیبا وەونەیانزانیبا چیە ، دەیانگوت ئەوە سەبیلەی شەیتانە !

- چۆن بوو ئەو سەبیلەی شەیتانە کەوتە دەست تۆ و چۆنت زانی چیە ؟

- تازە هاتبوومەوە

سەت جار لە من عەرەبی چاتر دەزانێ.زۆر شارەزایە مودەڕڕیسە وئیجازەی مەلایەتی دەدا. گاڵتە نیە. عەرزم کرد مامۆستا هەر وابزانە فەقێ یەکی شارەزوور- یم ولە خزمەتت دەرس دەخوێنم. دەکرێ برێکم یارمەتی بدەی؟ گوتی باشە. چیە؟ دوو دێرم لە قانوون دا خزمەتی وگوتم بۆم مانا کەوە.خوێندیەوەو مانای کردەوە. گوتم باشە ئەو "زەمیرە" (ضمیر) دەگەرێتەوە پاڵ کێ؟

سەروبنی لاپەڕەکەی خوێندەوە بۆی نەچۆوە سەریەک. کتێبی تووڕ هەڵدا وگوتی ئەوە عەجەمە وگەرەکی بووە لاسای عەرەب بکاتەوە وسەری لە خۆی وخوێنەر شێواندووە! لای بە ئەوە کاری کەس نیە!

شەو دیسان پێی دا چوومەوە. وەک موعەممایەک حەلم کرد وسبەی چوومەوە لای مەلا جەمیل و بۆم خوێندەوە. واقی وڕما. گوتی ئەتۆ بە فەقێ یەتی رەنگە موعەمما ولوغەزەت زۆر حەل کردبێ. ئەوەش، شتێکە ئاوا!

— مامۆستا بێ تەعاروف دەڵێم وەرگێڕانەوەی قانوون بەفارسی لەو ئێرانە پان وبەرینەدا لەنێو ئەوهەموو عەرەبی زان و مامۆستای زانستگاوئەدیب ونووسەرانەدا کارێکی لەرادەبەدەر گرینگە وهێشتا خەڵک سەرنجیان بۆ ئەم کارە گەورەیە رانەکشاوە. بۆئێمە جێگەی شانازی یە...

با بێینە سەر خودی کتێبی قانوون. ئێستا کە تەلیسمی وەرگێڕانەکەی بە زانست وهیممەت وتێکۆشانی جەنابت شکاوە. خۆی چۆن کتێبێکە. من برێکم خوێندۆتەوە پێموایە شتێکی سەیرە وسەرم لە زانستی بووعەلی لەو زەمانیدا کە تێی دا ژیاوە سوڕماوە. ئەوەش دەزانم کە تا سەت ساڵ لەمەوپێش هەر ئەو کتێبە لە زانستگاکانی ئوورووپا بەدەرس دەگوتراوە. بیروڕای خۆت سەبارەت بە نێوەرۆکی قانوون چیە؟

— ئەو زانایانەی لەسەر قانوون کاریان کردووە و لێیان کۆڵیوەتەوە پێیان وایە دایرەتولمەعاریفێکی گەورەی پزیشکی یە. من لەسەر بەسەرهاتی ئەوکتێبە زۆرم شت کۆ کردۆتەوە. پاش پەیدابوونی چاپ لە سەت ساڵی ئەوەڵ دا پازدە جار بەلاتینی و چەند زبانی دیکە چاپ کراوە. لە سەت ساڵی دوایی دا بیست وپێنج جار و لە چەندین هەزار ژمارەدا.هەر وەک خۆت گوتت تا سەد ساڵ لەمەوپێش وەک گەورە- ترین سەرچاوەی زانستی پزیشکی لە ئوروپا بەدەرس دەگوتراوە.

سەرت نەیەشینم بنەڕەتی زانستی پزیشکی یە.

— فەرمووت نایەڵێ تەواوی کەم .ئایا بەشێک ماوە وەرت نەگێڕابێتەوە. یان تەواو بووەوچاپ نەکراوە.

— کتێبی پێنجەمی ماوە. بۆ من ئاسانە. تازە زمانەکەی فێر بووم. وەک کوردی وایە بۆمن. راستی ئەوەیە ئەگەر کوردنەبووما یە نەمدەتوانی وەری گێڕم. پڕە لە تەعبیری کوردی. پڕە لەشتی وا نە فارسی یە و نە عەرەبی.

— لەو تەعبیراتە کوردی یانە دەکرێ نموونەمان بدەیەی؟

— هەر چەند شەولەمەوبەر تووشیعیبارەتی "قیامالکید" بووم. دەبێ مەنزووری چ بێ؟ "قیام" یانی هەستان تەواوی قامووسی عەرەبی چاو لێکە غەیری ئەومانایەی نیە. پێموابوو هەڵەیە. چاوم لەچەند نوسخەی دیکەی قانوون کرد لە هەموان دا هەر ئەوە بوو. وازم لێ هینا وگوتم نایزانم. شەوی دوایی هەر دە زەینم دابوو لەپڕ دیتمەوە. تەعبیرەکەی کوردانەیە. لە ژنانت بیستووە دەڵێ بەردێکیان

بەسەری کوڕەکەم داداوە و ئەوەند هەستاوە یانی ماسیوە ،ئەستوور بووە . بەڵێ "قیام الکبد" یانی ئەستوور بوونی کەبەد . وەرەمی کەبەد. کەبەزبانی عەرەبی دەڵێن "تضخم الکبد" نموونەی دیکە عەرەب دەڵێ "ایضا"" یا "اکرر" ئەو دەڵێ "ێشبە" یانی " وێدەچێ" کەکورد دەکاری دێنێ. لەزۆر جێگا لەجیات "دووبارە" عیبارەتی "علی الراس" دەکار دێنێ یانی "لەسەررا"لەجێگایەکی دیکە واژەی "ماست" دەکار دێنی لە کاتێکدا ئەوەی من بیزانم عەرەب پێنج لوغەتی بۆ"ماست" هەیە .

— مەمنوونم مامۆستا . ئەوجار باهێندێکیش باسی شیعرەکانت بکەین . خەیامەکەت شاکارێکی بێ وێنە یە . تەرجومەی مەموزین لەو بەرزترە .بەرەوموکریان قیامەتە .

— لە شیعرەکانم گەڕێ . هیچیان باش نین. هەموویان خراپن. خوێنەر دەبێ بڵێ کامیان باشە و کامیان خراپە.

— قوربان زۆرم ماندوو کردی پرسیارم نەماوە. هەر وەک دەزانی ئێمە لە کوردستانی ئێران تازە دەستمان داوەتە نووسینی کوردی. وەک مامۆستا هەژاری بەئەزموون وماموستای زبان وئەدەبی کورد چ رێنوێنی — یەکت بۆ لاوان هەیە. چۆن بنووسن ؟ چ بکەن ؟

— پێموایە زۆر چاک دەنووسن. چەندرۆژ لەمەوبەر لە وت وویژێکی رادیۆیی دا هەر ئەو پرسیارەم لێ کرا لەوێ گوتم کاکە ئەوە تیغی دوو دەمە. جارێ بزانین دەوڵەت لەگەڵ نووسەران چ دەکا ، دەوڵەت دەبێ تەشویقیان کا بۆ بووژاندنەوەی زبان و فەرهەنگی کوردی تێکۆشن . من حەز دەکەم لاوان تێکۆشن هەوڵ بدەن. فێر بن و بنووسن،

تا نووسین گەشە بکا . دەبێ لە سروەدا مەتڵەبی چاک بنووسرێ مەبەست هەر پڕ کردنەوەی لاپەڕەکان نەبێ. ئەوکارە قازانجی نیە.

— زۆر سپاس. پێموایە لەباسی ژیانت گەڕێم باشترە. لە پێشەکی کتێبەکانتدا هەیە.

— بەڵێ باسی نەکەین باشترە بەڵام بانەقڵێکت بۆ بگێرمەوە.

کابرایەکی عەرەب بە ناوی جەبر رێگەی کەوتە شارێک . رۆیشتە قەبرستان دیتی لەسەر بەردی قەبرەکان ماوەی تەمەنی مردووەکان نووسراوە بەڵام هیچی درێژی تەمەنیان ناگاتە دوو ساڵ. نووسراوە سێ مانگ ،شەش مانگ ، ساڵێک وشتی وا. پێی سەیر بوو قەبری تەواو درێژ. دیارە پیاوی تەواوگەورەی تێدا نێژراوە. ئەدی چۆن تەمەنیان وا کەم نووسراوە! گەڕاوە شار ولە پیاوێکی وێچووی پرسی ئەوە بۆ وایە. کابرا گوتی لەشاری ئێمە هەرکەس دێتە سەرە مەرگ لێی دەپرسن چەندت بەخۆشی رابواردووە .ئەویش دەڵێ دوو مانگ . شەش مانگ . ئێمەش هەر ئەوەی بۆ بە تەمەن حیساب دەکەین ئەوی دیکە بۆ عومرە!عومر ئەوەندەیە کە بە خۆشی رادەبرێ !

" جەبر" فکری کردەوە و گوتی :

" دەتۆخودا ئەگەر من مردم لەسەر کێلی قەبرەکەم بنووسن ئەوە قەبری جەبری کوڕی عەبوڵڵایە کە لەزگی دایکیەوە کەوتۆتە نێو قەبرەوە ! ئاخر لە ژیانمدا قەت دەقیقەیەکی خۆشم نەدیوە."

ژیانی منیش هەر وەک جەبر بووە !

— قوربان زۆر مەمنوون. ئەوشۆ زۆر ماندوو بووی و زۆر پرسیارم ماون . هەڵیاندەگرم بۆهەلێکی دیکە.

— با بزانین .

ـ دایە بەسەری تـۆ هەڵقرچابوون. تاس کڵاوە روو‌ـ
چیدی بەقسەی تۆ ناکەم ! تاوەکەی هەر بەسەرەوە بوو
حەیاتم لێ بڕا پیاو ! دەسماڵی مەلمەلی سپی گوڵ
ئەوەندەی گوت و مات وردی بەسەر تاس کڵاوەکەیدا
بوو. سەری بەرداوە. هەوەڵ دابوو. بەلکی پاش گریـی
جار بوو لەرووی دایکی چارشێوشانە قولاپـی یەکەی
وەردەگەڕاوە. تەوێڵێ ئارەقەی چاوی سڕیەوە وسەری هەڵێنا
شەرمی لێ دەتکاوە. نەیتوانی و گوتی :
درێژە بە قسەکانی بدا. ـ باشە بەکەیفی....
دایک لەسەرەخۆ چاوی لێکرد لەرزەی لێوەهەڵقرچاوەکەی

ئەویش هەوەڵ جار بوو ئیزنی دەربڕینی نەداودیسان
وایان دەدواند. قەتلە پەڕی سەری بەرداوە. ئەمجار پاش
گوڵیان کالتر پێ نەگوتبوو. تاوێک دەستەکانی هەڵێنا و
چاوە پرووشەکانی ئاویان سووچی دەسماڵەکەی تا نێو
تێزا بوو. بەسپایی لەسەر یەکی چاوانی هێناوە وگوتی:
دانان ودوو دڵۆپ فرمێسکی ، ـ کەیفی خۆتە زێوە
پاڵاوت. فرمێسک بە کەوشەنێ گیان تازە قسەت لەکاری
لووت ورووومەتیدا خزاو هاتە ناکەم.
سەر سووچی لێوەرەشهەڵگەڕاوە زێوە تاقە کوڕەی دێد
بارهێناوەکانی. لەسەرەخۆ بە ئەستی بوو. بە منداڵی
قامکی شادە سڕیەوە بەڵام کاکۆڵی وەک ئاوریشمی زەرد
یەکی دیکە جێی گرتەوە و بوو. لە خۆشەویستی یان
بۆی حەشار نەدرا. لێوەکانی بابی پێی دەگوت «زێوە».

خاڵی ناوی نابوو " مراد"
چون لەسەر شەخس بەمرادی
خواستبوو بەڵام هەموو هەر
بە زێوەیان دەناسی ووایان
گاس دەکرد.
زۆر زوویان ژن بۆهێنابوو
بابی هەر بەم ئاواتە بوو
زوو نەوەکەی ببینێ بەڵام
منداڵیان نەدەبوو.زێوە زۆر
تووڕە بوو. جارجار بیری
دەکردەوە کەبێکەسە. لەخۆوە
دەرهەڵدە بوو. پاش تاوێک
خاو دەبۆوە. دەچوو لە
فکرەوە. جارێک لەسەر نۆرە
ئاو لەگەڵ میراو دەمەقاڵەی
لێ پەیدا ببوو..... هەر
لەخۆوە جاڕزو وەڕەز بوو..
بەتایبەتی پاش مەرگی بابی
هەستی بە بێکەسی دەکرد.
تەنیا هومێدی دایکی بوو.
خێزانیشی لەو باشتر نەبوو
ئەگەر کاری نێومال تەواو
دەبوو لەسووچێک مات دەبوو
کەسی نەدەدواند. تەنیا لە
داوەت دڵی دەپشکووت ئەویش
ئەگەر زیڕەی منداڵێکی
دەبیست تووڕە دەبوو،دەستی
دەکرد بەپێ هەڵکالان. خۆی
زۆر کەم دەهاتە بەرچاو...
پێی وابوو هەموو دەستە
خوشکەکانی لەو باشترن.....
زێوە چاوی گێڕا ، لە
تاتێ یەکەی بنی روانی کە
چیلکە گەسکێکی لەسەرکەوتبوو
هەڵیگرتەوە وبەدەستی یەوە
گرت وبۆ زاری هێنا تا
کولێنی ددانی پێ بژەنێ.

بەڵام لەرووی هەڵنەدەهات
سەر هەڵبڕێ و بڕوانێتە
هەنیەی دایکی..هەناسەیەکی
هەڵکێشا وچۆ کێکی هەڵدا و
دەستی بەسەردا شۆڕ کردەوە.
مات ببوو. هیچی پێ نەدەگوترا
هەستا وەدەر کەوت .

دێدئەستی چاوی لێکرد
تا لەدەرگا وەدەرنەکەوت
نیگای لەسەر هەڵنەبڕی
دوایە بەسپایی رووی وەرگێڕا-
اوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و
دەستی بە بیرکردنەوە کرد .
دەیزانی زێوە لەوانەیە
لەرووی وەرگەڕێتەوە بەڵام
هەموو دەردی بێ مندالێ یە.
ژنەکەشی زۆر لاسار ببوو
تاوێک لەوەپێشی وەبیر هاتەوە
کە کاسی فاتمی کردبوو
بێتە لای وهیندێکی قسە بۆ
بکا .

- زێنەب کچم -! بۆ وا
نارەحەتی .

- چووزانم ! کوا
نارەحەتم.سەمات بۆ بکەم ؟

- نا رۆڵەم. تۆ بۆ
پێت وایە من دوژمنی تۆم!
دەردت چیە بیلێ ؟

- دەردم نیە! ئەگەر
ئەتۆ لەکۆڵمان بیەوە من
ئاسوودە دەبم .

- جا رۆڵەم چ بار
گرانیم لەسەرتە..دایکەکەم
خوشکەکەم..پیرێژنێکی مات
وبەستەزمان دانیشتووم ئەگەر
پارووە نانێک بوو دەخۆم
دەنا شوکری خودا دەکەم.

- واخۆت فەقیر مەکە.
ناوێرم بجوولێمەوە دەچی
بە زێوە دەلێی ئەویش لێم
دەرهەلدەبێ .

- ئایارۆ کچم زگم
سووتی درۆ دەکەی! ئەتۆ
چەندساڵە کوندەجەرگت کردووم
بۆچما قەت باسم کردووە .
کچانم بەخودای زارم پڕبێ
لە خوێن ناوێرم لە لای
زێوە بیکەمەوە.تۆلاشە،کەللە
رەقە، دەرهەلدەبێ. دەستێک
خێر، یەک شەڕ. ئەوە هاتوو
زیانی دا...من چۆن لەخۆفی
خودا رزگارم دەبێ....

- نەخێر ناوەڵڵا وانیە
ومن پیرێژنان جوان دەناسم.
ئەتۆ فەرهادکوژی.

- بەندەناس خودایە !
خودا هەقم بکا. جا وەرە
توخودا جەفای سەگم لەگەڵ
ئەو ماڵە کێشاوە ئێستاش
عەمری پیرەمەڕێکم ماوە
نەیەلن پارووەنانێکی بە
رەحەتم لەئەوکی ئاوابێ....
هەستە لەبەر چاوم فاتم....
هەستە.

فاتم دەرکەی پێک دادا
و وەدەرکەوت .هێندەی پێ
نەچوو زێوە هاتەوە ومات
هەڵکورما. فاتم لە پشت
دەرگا راوەستا. زێوە گوتی:

- دایە دەلێی گریاوی ؟

- نا کوڕم هیچ نیە!

- ئەی چۆن هیچ نیە!
ئەوەنیە دەگری ؟

- وەبیر بابت کەوتوو-
مەوە.

- پاش مردووان رەحمەت
چاکە...بەڵام قەتی گەردن ئازا
ناکەم.تۆقی نەحلەتی لەستۆ
پەستاوتووم. بەخودای هەموو
خەمی فاتە لەبنی هێنام...

- کوڕم خۆ مندالێ نی!
ئەو قسانە چن.ژنت ژنی
چاکە...دەبێ بەزمانی بزانی..
ئاخر ئەو لەتۆ زیاتر
کەسی نیە. دایک وباب لەو
سەری دنیا بەوی چی داخودا
سالێ جارێکیان بینێ یان
نا...کەسی ئەو هەر تۆی.

- دایە زۆر زمان شڕە.
وەڵڵاهی جەرگ ئاوسی کردووم.

- نا زێوە گیان :...
لەسەرەخۆ بە....تۆخەتاباری..

- دایە توخودا بەسە..
چەند ساڵە بەوقسانە فریوم
دەدەی. بەقەبری بابم لەبەر
دلی تۆ نەبا شەش ساڵ
بوو تەلاقم دابوو....

- ئایارۆ جابۆ ئەو
ئەتکەش بەخۆت ناکەی. رۆڵە
ژن کراس ودەرپێ یە ئەگەر
کۆن بوو فرێی بدەی ؟......
ژن وزێر هەتا کۆنتر بن
بەقەدرتر دەبن ئەتۆ چۆن
دلت دێ ژنت دەلێی قونچکە
زێڕە... بەسە ئەگەر منت
خۆش دەوێ قەت ئەو قسەت
بەزاریدا نەیە.

- دایە....دەزانم تۆش
فریوم دەدەی.... زۆریان
پێ گوتووم کە فاتێ چەند
بۆ تۆ خراپە...منیش لەگوێی

گادا نەنوستووم.
ـ درۆیە...کورم.درۆ...
چەند ساڵە بووکی منە
ئێستا لە گوڵی کاڵتر پێ
نەکوتووم.تەواو زارمهەڵنابڕم
دەگاتە سەرم ودەڵێ:بەڵێ...
کێ ئەو قسانە دەکا...چۆن
لێی قەبووڵ دەکەم. ئەمن
ئەگەر لێی نارەحەت بم
بۆ ئەوە بە تۆ بڵێم
دەینێرمەوە ماڵەبابی.......
ـ دایە بەسەری تۆ
چیدی بەقسەت ناکەم. حەیاتم
لێ برا پیاو...

دێد ئەستی هەروا لە
فکردابوو.هەناسەی هەڵدەکێشا
وەتێ باپیر مردبوو دڵی
زۆر ناسکتر بوو بەڵام
نەیدەویست کایە بە ژیانی
کوڕ و بووکەکەی بکا.هەموو
جارێ خوێناوی دەخواردەوە و
قەت بۆ جارێکیش لەلای زێوە
باسی هیچی نەکردبوو...

چاوێکی لە سەماوەرەکە
کرد. شەمچەکەی لە گیرفانی
کولێجەکەی دەرێنا وئاگری دا.
سەماوەرەکەی هەڵکرد و بە
دیاریەوە دانیشت .

فاتم وەژوور کەوت .
بەڵام قسەی نەدەکرد. لەبەرە
خۆیەوە فکری دەکردەوە "بێ
ونەبێ خەسووم زانیویەتی
من خۆم گرتووە بۆیە وا
خۆی شیرین دەکا" چاوێکی
لە سەماوەرەکە کرد. بووک
و خەسوو بێدەنگ ببوون
بەرجی هازەی سەماوەر هیچ
دەنگێک نەدەهات .

دێدئەستی بە پەرۆشی
کوڵوانەکەی توند کرد .
دەسماڵەکەی کێشاوە سەر
نێوچاوانی ودەستی دەپشت
گرت تاوەدەرکەوێ .

فاتم خێسەیەکی دایە و
لێوی داچۆڕاند. لەبەرەخۆوە
گوتی:"ئاوری بن کایە.ئەوە
زیز بوو.ئەوجار بەدەرکردنم
دەدا. تازە تەواو بوو.هەی
خودا بت گرێ فەرهاد کوژ.
ئەگەر قسە دەکا وادەزانی
راست دەکا ودڵت بۆی دەبێ
بە ئاو...بەوخودای نایەڵم
منیش بەدوایدا دەڕۆم.......
جارێ با بزانم دەچێتەکوێ!

دێدئەستی هەستا بە
هەناسەساردی وەدەرکەوت.
خات شەمامی تەشی ڕێس جێی
هاوار وبانگانی بوو. دەچوو

تێر لەلای دادەنیشت ودەردی
دڵی بۆدەکرد.
ـ شەمام وەباڵی تۆم
بەستۆ قەت خۆ لە کاران
هەڵناقوتێنم. ئەو هەتیوەم
دەڵێی خەرفاوە.کەس نازانێ
چ دەکا. تا ئێستا قەتی
جوابەجەنگی نەکردبووم،ئەوڕۆ
وەختبوو لەسەر فاتەی لێ
بدا.
ـ ئاخر لەسەر چی ؟
ـ جا بڵێم لەسەر چی؟
دەڵێ ئەتۆ بەمن ناڵێی
فاتە لەگەڵت خراپە. خەڵک
دەڵێن وبەگوێم دەگاتەوە .
تۆش هەر بەلای ویدا دەکێشی
و بۆی دەپارێیەوە.....
ـ راست دەکا ئەی!....
ئەو کچەتیوە گەورەوچکۆلەی
لەبەر نیە. کچێ ئەستی ئەتۆ
بۆخۆت لەبیرت نیە لەگەڵ
خەسوو چون بووی ؟ ماڵتە
مەیلی کچەکانی نابوو.
ـ خوشکێ گلەیی مەکە .
زەمانی مە شەرموحەیایەک
هەبوو. ترسێک هەبوو. گەورە
وچکۆلەیەک هەبوو. نازانم

ئێستا بۆ وای لێهاتووه.

ـ ئەگەر بەقسەی من دەکەی دانیشە ونسحەتی بکە

ـ کچی چەنەم لە زاری کەوتووه. نسحەتی چی؟ با هەستم بڕۆمەوە ئێستا زێوە دێتەوە و وادەزانی زیز بووم.

ـ قەیدی ناکا پێمخۆشە بزانێ. دانیشە با بۆ من قسەی لەگەڵ دەکەم.

لەو دەمەدا لەدەرگایان دا. خات شەمام دەرگای کردەوە. فاتم بوو. هاتە ژوور سڵاوی کرد ولاشیپانی دەرگای گرت :

ـ وەرە ژوورێ فاتم. بۆ لەنێو دەرکە راوەستاوی؟

ـ ناوەڵڵا دەڕۆم. هەر هاتووم بزانم خەسووم بۆ رۆیوە ؟

ـ کچم من شەڕم لەگەڵ کوڕی خۆمە! تۆبۆ نارەحەتی.

ـ شەڕت لەسەر ئەوەیە کە بەقسەت ناکا و من تەلاق نادا ؟

ـ نا کچم! قەرارە تۆ تەلاق بدا و لەسەر تۆش جنێوی پێدام. بۆیە لێی تۆراوم و تازە کارم بە کاری نەداوە .

ئفاتم سوور هەلگەرا لە شەرمان لەرزی ونەیتوانی خۆ لەسەر پێ رابگرێ.هەڵترووـ شکا ولە پرمەی گریانی دا. دێد ئەستی و خات شەمام چاوێکیان لێکرد وهەردووک دەیانویست قسەیەک بکەن . دێد ئەستی هەستا . دەستی لەستۆی فاتم کرد و ماچی کرد. فاتم هەستا سەر پێ. دەستی خەسووی ماچ کرد . خات شەمام لەسەرەخۆ دەگریا . هەموو دەگریان بەڵام یەکیان لە خۆشیان یەک لەهەیبەتان و یەک لە شەرمان .

ماڵی خات شەمامیان بەجێ هێشت. دێد ئەستی لەوە کە توانیبووی بەفاتم بسەلمێنێ کە هەقە شاگەشکە ببوو. دەیزانی زۆر گرفت چارەسەر کراوە .بەپێکەنین بەرەوماڵ بوونەوە. دێد ئەستی وەپێش کەوتبوو فاتمیش لە دووی.دێدئەستی لەنێو ماڵ رووی لە فاتم کرد وگوتی :

ـ کچم فاتمگیان ئەگەر لەبەرت زەحمەت نەبێ وەرە پێیەکم لەپشتی بنێ.پێموایە دوێنێ شەو لەبەر پەنجەرە دانیشتووم قوڵنجم کردووە .

ـ بەچاوان پووریگیان ! راکشێ......

دێد ئەستی ئەگەرچی لە خۆشی یان گریێ لەدڵ براببوو راکشا وفاتم بەجێی ئەوە بەپێ بچێتە سەر پشتی هێدی هێدی بەسەر پەنجەی دەستی قوڵنجی دێد ئەستی شکاند. یەک دوو جار قامکەکاـ نی خۆشی تەقەیان لێهات . پاش ئەوە کە دڵنیا بوو قوڵنجی خەسووی شکاوە چارشێو شانەکەی ئەوی هەڵداوە و دەستی بە نەرمە شێلان کرد. لەو دەمەدا زێوە بەتووڕەیی وەژوور کەوت وگوتی:

ـ کچێ فاتم...

بەڵام نەیتوانی درێژە بە قسەکانی بدا. چوون هاتبوو بلێ خۆ ساز بکە دەتبەمەوە ماڵی بابتکەچی زۆر تەریق* بۆوە وگوتی:

ـ دایەگیان دوور بێ ناساخی .

ـ نا کوڕم پشتم دێشا ئەویش فاتم خودا چاکەی بۆبکا دوو سەعاتە دەمشێلێ .

ئەوجار رووی لە فاتم کرد وگوتی :

ـ بەسە کچم بەدایکی کوڕان بی. وەڵڵاهی پشتم سووک بوو. بڕۆ چایەکەی دەمکە زێوە برسی یەتی.

فاتم هەستا وەدەرکەوت. دێد ئەستی کە کوڵی گریانی لەئەوک* مابوو ولە خۆشی یان قسەی پێ نەدەکرا گوتی:

ـ خۆ ئەوجار بەچاوی خۆت دیتت ! کوڕم فاتم لەجێی هەموو کەسمە.ئەوانەی قسە دێنن ودەبەن گوێیان مەدەیە. ئەوان چاویان بە ئێمە هەڵنایە و لەخۆڕا پێمان هەڵدەکاڵێن....

زێوە بەشەرمەوە دەستی لەستۆی دایکی کرد بەڵام هەرچی کردی وکراندی نەیتواـ نی هیچ بڵێ....

# ژیانی من:

# خاڵەمین

براتان سەیدمحەممەدئەمین شۆڕەت بەرزەنجی م وخەڵک بەخاڵەمین م دەناسن. بابم حاجی شێخ مستەفای کۆکەیە. شاعیری بەناوبانگی کورد سولەیمان زێوەرئەفەندی لە شەڕی نێو نەتەوەیی یەکەمدا کە هاتۆتە ئەو ناوچەیە گوتوویە:

**وتی شێخێ لە کۆکە زۆر کۆکە**
**ساحێبی جووت و ملک ومالێ وەبەڕ**
**بەلێ ئەو شێخە وەک دەلێن باشە**
**تۆ بلێی هیچ بکاتە نامە نەزەر؟**

بەکورتی قەسیدە کە دوور و درێژەو هەر ئەوەندەی باسو بابم تێدایە. حاجی شێخ مستەفا کوڕی شێخ عەبدولغەنی یە. ئەویش کوڕی شێخ محەممەدئەمینی هەزار مێردی یە. ئەویش کوڕی شێخ حەسەن، ئەویش کوڕی شێخ سمایلی بەرزەنجی یە.

دایکی ڕەحمەتیم فاتمە خانم لە تیرەی بەگزادەی بورهان بوو. ئەویش وەک بابم زۆر لە دین دابوو. حەوت برا و خوشکێکم هەبوو کە ئێستا تەنیا من ماوم بۆ چەرمەسەری ئەو دەورودوکانە یا بۆ هەرچی! خوا ڕەوای بینێ دوو کوڕم هەن بە ناوی سەید عەزیز و عەبدوڵلا. سێ کچی بە شوو و چاردە نەوە و سێ نەتیجەم هەیە، جگە لە هی مردوو.
وا هەست دەکەم نەدیدەش ببینم.

وەختێک باسی کۆکە دەکەم کە جێی لەدایک بوونمە و دێیەکبی چووکە و خشپیلانە و لەسەر دڵانەء دەبێ چەند جار ناوی کۆکە دووپاتە بکەمەوە. (بەشی کۆکە کە کورتە باسێکی مێژوویی یە لە ژمارەکانی دیکەدا چاپ دەکرێ)

لە ساڵی ۱۳۳۶ی کۆچی بابم بەهۆی هەل ومەرجێک کە بۆی دێتە پێش کۆکە بە شەش هەزار تمەن بە عەلیاغای حاجیەلخانی دەفرۆشێ و ماڵمان دەچێتە بۆزە کە لە سی کیلۆمێتری مەهابادە.

لەوێ وەبەر خوێندنیان نام. سێ پارەی ئەلف وبێ، دوایی جزوەی قورئانی پیرۆز و سمایل نامە و ناگەهان و ئەی شودە (شیعری شێخ مەعرووفی نودهی)م خوێند. ساڵی ۳۸ی کۆچی گوندی قسقەڵای لاوێرانمان کڕی و بلێین لە حەوت و هەشت ساڵیداچووینە قسقەڵا بۆ خزمەت مامۆستا مەلا کەریم نەوەی خەلیفەی گراوی و لەوێ دەستم بە خوێندنی تەسریفی مەلا شێخ حەسەن کرد. دوایە ناردیانە

سابلاغ بۆ خزمەت **مەلا حوسێنی مەجدی** . شێخ حەسەن برای گەورەم لای ئەو دەرسی دەخوێند و منیش کە سوختە* بووم لەلای **مەلا محەممەدی لاجانی و مەلا محەممەدرەئیسی بۆکانی و مەلا یەحیای بانەیی** کەموستەعیدی ماموستا بوون دەرسم خوێند. دوای یەک دوو ساڵ من حوجرەی خۆم لە کاکم جوێ کردەوە و چوومە **مزگەوتی حاجی سەید بایز** بۆ خزمەت فەیلەسووفی کورد خوالێخۆشبوو **ئەحمەدی تورجانی زادە** کە **مەلا محەممەدی** براگەورەشی هەر لەو مزگەوتە دەرسی بە **مەلا ئەحمەدو** فەقێکانی دیکەش دەگوتەوە. بەڵام بەداخەوە سەت مخابن* لەو دەریای پان وبەرینی زانین من لە چەن دڵۆپێکی بەئەژمار پترم پێ نەبڕا ، چون نەخۆش کەوتم وسینگ وگەرووم خوێنی لێدەهات .پزیشکی کاتیش گوتی :

" دەبێ دەست لە خوێندن هەڵبگری و بچیە کوێستان و زەنوێر و جێی خۆش ئاووهەوا .

راستە من خوێندنم لای وان تەواو نەکرد بەڵام **دوو گەوهەری بایی دار و بەبایەخم لێوەرگرتن. یەکیان خواناسی ( تەوحید) و دووهەم نیشتمان پەروەری کە ئەوانیش ئەم دوو گەوهەرەیان لە لایەن مەلا ئەحمەدی فەوزی کە لە** سولەیمانیەوە پەڕیوەی ئەو وڵاتە ببوو پێگەیبوو، کە لە دواییدا ئەم رۆشنبیری-یە بەشی زۆری کوردستانی ئێرانی داگرت .

جاوەک پێشوو رامگەیاند بنەماڵەی ئێمە شێخ و رابەر بوون بەڵام من ئەگەرچی ئامرازی شێخەتیم بەسانایی بۆ پێک دەهات (دوو گەزە شاڵی سەوز و سیواکێک و عەبایەک) خۆم لەو دەرەتەی نەدا هەڵبەت لەبەر دوو شت :

یەکەم: دارایەتیم هێندە نەبوو ئەو کارە ئەستەمە وقورسەی پێوە سەربارخەم پێشم نامەردی بوو زۆر لە خەڵک وەرگرم و کەمێکی ئەدەمەوە بە خەڵک .

دووهەم: تێوەڕامام. بارودۆخی شێخەتی بە تەواوی گۆڕاوە .

بەکورتی با بگەڕێمەوە سەر باسەکەم لەبەر نەخۆشی نەمتوانی خوێندن درێژە بدەم. وەدووی چادر وچیغ کەوتمو چوومە کوێستان. کاتێک چاوم بەو مەڵبەندە کەوت ، هەر نواڵێکی* دەمدی هەمووی زەمەند وگیای جۆراوجۆر ملیان داوەتە یەک ، مەندۆک وبیزا وهەڵزوکەما لێک ئالاون وتێک چرژاون. کەوی یە بەفرەکانی لەندی شێخان هەر لاپاڵێکی تێوەی رادەمام دەتگوت جەندەکی دێوی سپی یە وئەستوورو درێژ، تێیدا کەوتووە. ئاتەگەکانی چۆڕ چۆڕەی ئاوی وەک چاوی قرژاڵ لەبەر دەڕوا وبە گوڵی زەرد وسوور و ئابی خەملێوە، دنەدانی ماموستا تورجانی بۆ شیعر وشاعیری هێنایەوە بەر زەینم. هەستی شاعیرانەم بزووت و پێنج بەستەم شیعر دانا کە یەک لەوانە ئەمەیە .

**پچۆ لای کوردە کاکی ژێر زرینگ**
**چونکە جێی کوردە دەس بنێ سەرسینگ**
**پێی بڵێ خاڵەمین دەڵێ تاکەی**
**گەنم وجۆ چان وپوول جرنگەجرینگ**
**زۆر چەتوونە کە تێ بگەن تاکوو**
**لەبنان گوێ ونەدەن بەپاچ وقوڵینگ**
**پیاوی دنیایی یا خودایی بێ**
**سۆفی شەو یاهەواخورانی گزینگ**
**سەربەخۆیی وەگیر دەخا هەردووک**
**نەک بە حیزە بخۆی ورینگە رینگ**
**پیشەی پێشینەو رەچاو کەن تا**
**کوڕی کەروێشک و بۆببێتە پڵینگ**
**شوێنی وان پیاوەتی بوو ئازایی**
**بۆ عەدوو داندراوە گێزو گوڵینگ**
**رێک کەون بۆخۆ چیدی رێک مەکەون**
**چۆکی زل کوڵەوارە بێ گوێزینگ**

باوەڕم پێ بکەن کە بۆنگۆیە
هێندە دەگرم لە ئێوە من بەربینگ*
دوێنێ بولبول لەنێو گولان دەیگوت
چەن بە سۆزێکی خۆش وورینگەورینگ
بە ئومێدی خودا و پێغەمبەر
بەدڵی گەرم و چاوی سوور و تەڕ
کوردەکان چیدی سەرنەوی نابن
هەر ئەوەندە نەختی بوخوئازابن

وەکی هەر خۆشی یەی ناخۆشی یەکی بەدواوە پاش چوار پێنج ساڵ ژینی ئاران و کوێستان لەنەکاو کاغەزێکی خوێن تاڵیان دا دەستم. خوێندمەوە :

" لەو لەندی خۆش ئاووهەوا وسەری گۆڕ ونەرمان، قەراغ و ئاتەگەکانی* زەرد وماە وتەرت و لابەلا سەربەرەژێر دێیەوە بۆ سابلاغ و لەوێوە بۆ ورمێ. دوو ساڵ سەربازی ! جابڵێم چی گوتوویانە ئاوی زۆردار سەرەوژوور دەڕوا!

سەرت نەیەشێنم گروهبان دووەم خاڵە مین ساڵی ١٣١٢ای هەتاوی لە ورمێ خزمەتی کرد. ساڵی ١٣١٤ ناردیانمە سابلاغ و ئیجباریم لەوێ تەواو کرد.

هەر لە ورمێ ولەزەمانی سەربازیدا بەیادی چادروچیغ و کوێستانەکانی کوردستان هەڵبەستی ژێرەوەم هۆنیەوە:

لەزستانێ رەها بوو دڵ بەجێ هات
ئاخ و ئاواتی
بەهارە و خاکەلێوە رۆی بەخێربێی
بانەمەر هاتی
زەوی خەملیوە سەرپاکی هەوا وەک
رووحە سەرتاپا
دەجا سۆفی هەتاکەی سەرلەنێو پێخەی
خەیاڵاتی
ئەوانەی عاشقی روون باوەشی وان پڕ
لە دڵدارە
ئەتۆش هەروا خەریکی واهیمەو کەشفی
سەماواتی

سەفی حۆری تەماشاکە بخوێنە زیکری
لا حەولە
گەلی بێری ببینە ئابناسێ قودرەتی
زاتی
بە چادروچیغەوە کەوتوونەدەر ساحێب
مەڕوخێلات
دەڵێی هوڕڕای نیزامە کاڕوکوڕی بەرخ
و ماڵاتی
نەمێنم نابیەم سمکۆڵ وکۆڕەی ئەسپی
سەر خێلی
نەژیم نابینم ئێستا دیوەخان وداب
و داهاتی
نەتاولی پڕ لەمێوانی نە خزمەتکاری
سالانی
غولامی دەس لەسەر گوێ خەنجەرێ بێو
چاوی لەولاتی
بەباغی میللی و کافە و خەیابانی
رەزائیە
لەدڵ دەرناچێ سەیری شارویران ودەشتی
شاماتی
بەبێ وی تالە کوێستان وخوسوسەن چۆلە
هەمزاوا
بواکەی خۆشەویستم کا وسێن تۆش بۆیە
وا ماتی ؟
لەسەر جێ خێلی خالم خێلی کێ داخۆ
هەڵیداوە
لەجێی تورجانی داخوا کێ دەکا سەیرو
مولاقاتی ؟
لەباتی زەمزەمەی دەنگی گراماڤونی
تاولی پار
ئەویستێ قوولە قوولی بایزی داودە و
حاجی هات هاتی
هەزار ئاغای فکۆلی و گەنجی دیپلۆمو
سیاسی باز
بەقوربانی سمێلی خدرەگڕوێی پیاوی
عێلاتی

**هەزاران فۆرم وپۆزی خانمەکانی پاریس وئەڵمان**
**فیدای دەسرۆکەکەی هەوری کچی کرمانجی دێهاتی**
**دڵم وەک بولبولی گۆیا دەخوێنێ ئاخ کەتێی ناگەم**
**هەوای سابڵاغە کەوتۆتە سەری یا لەند و خێلاتی ؟**
**لەوێ هەر کەیف وکامەو کاری ئێمەش لێرە "دەرجایە"**
**خودایی عالەم وئادەم چ بێ باک و موبالاتی**
**دەزانی خاڵەمین لۆمەی نەکەن گەریارو و دۆستانی**
**بەڕاستی دیتنی چادروچیغی کوردستانە ئاواتی**

بەم جۆرە دوو ساڵە سەربازی تەواو بوو و چوومەوە قسقەڵا و چاوم بە دیداری باب و براکانم روون بۆوە و ئەمجار خەریکی سەڕافەتی مەرومالْ وکشت و کالْ بووم. ماڵێکی تەبا و تێر و تەسەلمان بوو چەن ساڵێک هەموو لەسەر کاسە و سفرەیەک حاوا بووینەوەو شامان بە سەپان* نەدەزانی بەڵام رۆژگار چاوی بەرایی نەدا و چاوو زار کاری خۆی کرد. سوڕی* سەر هەڵوەشین و ئاسمانی نالەبار لەبەریەکی هەڵوەشاندین و من ماوەیەک دوای وەفاتی بابم بەشە مڵکی خۆم فرۆشت و وا رێک کەوت چوومە میاندواو ماوەیەک مامەوە وبوومە پێخۆست* وباریک بووم زۆرم نەمابوو بشکێم کەچی خودا رێکی خست ، خانوو ودووکانێکی هەرزان بایم کڕی و وێڕای دۆستێکی بەڵەد چوومە تاران وکەل وپەل وکووتاڵم کڕی و لەبەر چەند هەل وهاتێک کە بۆم لوا رمێنێکی* باشم کەوتە سەر و تۆزێک خۆم چەقاندەوە وبڕێک بووژامەوە و دەستم بەسەر وسمێڵم داهێناو خەریک بووم ببمە شتێک ، کە لەپڕ هەڵا هەڵای موسەدیق هاتەگۆڕێ، شایان رەپێنا ومام هێمن بەغدای بۆ کردە نیوەڕێ وخەڵک وەک مارومێروو دە شەقامان رژان وتێک چڕژان و "پتۆپی شا" وبژی موسەدیق"گوێی خەڵکی کەڕ دەکرد. چەند دووکان و قاوەخانەیەک لە بەر شا دۆستی تێک دراو لێک دراو کرا ئەوەی کرا .

دوای پشوو دان و حەسانەوەیەک لەو هەموو ماندوویە و خۆپێشاندانە لەنەکاو هەر لەو رۆژەدا رادیۆ رایگەیاند، شا گەڕاوە. هەر ئەو جەماوەرە خیزوخۆڵەی ساتێک لەمەوبەر بەرەودوا بە شەقامەکاندا گەڕانەوە و دەستیان کرد بە "بژی شا" و «نەمێنێ موسەدیق»!.

پاش چەند رۆژ شار ئارام بۆوە بەڵام دیاربوو بەجۆرێکی نەتەوی چاو لەو کوردە دەکەن کە لە میاندواو بوون. ئەوە بوو کە ئەوێم بەجێ هێشت و چوومە سابڵاغ.

سابڵاغم زۆر بەدڵ بوو ،شارێکی خاوێن و خەڵکێکی تێگەیشتوو وباش. مزگەوتەکان هەموو بە بانگ وسەڵا وجومعەوجەماعەت . شەقامەکانی تروسکە وبروسکە وخاوێنی لێ دەباری. بەتایبەتی بەشی زۆری شار لە بنەڕەتەوە هەڵوەشاو سەر لەنوێ بە بارودۆخێکی باشتر ورێکتر رۆنراوە.

گۆڕی مەلا جامی کرا بە مەیدانێکی پان و بەرین وقەبرستانی ئاتەکی داشامەجید لەجیاتی ناخی مردووەکان زیندووەکان لە دووقات وسێ قاتی تێی خزان .

بەڵێ: سابڵاغ خۆش و خاوێن بۆوە . لەبەریەک رەوێوە. گەورە بۆوە.هەر گەورە بۆوە. بەڵام من بەداخەوە چووکە بوومەوە و هاتمەوە سەر حوللەمەرەسێ* .

منداڵ لە دەورەم ریز بوون وماڵم هەمێشە قۆناغ بوو ناچار سەربەرەژێر

دامقەڵەشتە* خوار. جەڵدیان بگرە وهاتم. نزیک سێ ساڵ کە لەوێم رابوارد زۆرم، کوێرەوەری ومەرارەت دی. منی هێلکە* و رۆن خۆری هەتاو نەدیو بەسەری پیری وێڕای دوو کاردارەکانم خالید وئەحمەد کاری فەلەخۆییم* دەکرد. ئەوان مەڵەغانیان دەکێشا ومنیش درمغم لەدوو دەکردن تووتنم دەچەقاند. سەرچنم* دەکرد. بەرم دەناوە. ئاوم دەداشت و چی وچی ....

ئاخروئۆخری تەمەنم بوومە چەقەڵە*ی ئاش. بەڵام ئەگەر باوەڕم پێدەکەی لە لانی هێزی دڵەوە ورەم بەرنەدا ورۆژ بە رۆژ ئەگەر لەبەر چەوسانەوە لەشم ساوا دەبوو گیانم بەهێزتر وهومێد بە بەزەی خودا زۆرتر دەبوو. دڵگەرم دەبووم و دەمگوت :

" من کەسێ نیم کە لە ئاسمانێ
بکێشم منەتێ "

ئەوە بوو کە لە جەڵدیان سوورە ی پیرۆزی ئەنعامم لەگەڵ چەند ئایەتێکی دیکە لەبەر کرد کە ئێستاش لەبەرمن. بەستەی چنچکێ وپنچکێ وچەند شیعری دیکەشم هۆندەوە. وەکوو بیستوومە خەڵک پەسەندیان کردووە .

منداڵەکانم لە جەڵدیان بەرە بەرە هەراش دەبوون وفێرگەی ناوەندیشی لێ نەبوو جا دەبا ئەوجاریش پەڕ* بۆ لایەک هەڵاویم وقەل فرێکێ* بۆ بکەم. میاندواو و سابلاغ قوونەکە*و کراون و گەڕانەوە بۆ ئەوانە بێ مەزەیە. خۆش و ناخۆش بامداوە بۆ نەغەدە .

ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی لە ماشێنەکەدا دەستم روو بە ئاسمان بەرز کردەوە و پاڕامەوە :

خودایە دوامین کۆچ بێ و چیدیم لێرەولەوێ نەدەی. سپاس بۆ خودا کە ئەو نزایەم لێ وەرگیرا.

دیسان دووکانێکم گرت وخەریکی کەل وپەل فرۆشتن بووم وهەم. جاروبارەش، موشتەری یەکانم بە بەندو باو دەدوێنم.

لەو ماوەدا کە لە نەغەدەم، عەزیزی کوڕم دەورەی دوکتۆری تەواو کردووە و ئەوانی دیکەشم دیپلۆم وسەردیپلۆمیان وەرگرتووە و داوو دامەزراو بوون .

جابا سەر لەنوێ دەست پێ بکەمەوە. لە تەمەنی خۆم دەپرسی بەداخەوە رۆژی لەدایک بوونم نەنووسراوە بەڵام بە حیسێبی ماڵە دایەنم.

پوور رێحان و دوو کوڕی سۆفی عەبدوڵڵا و حاجی دەرویش کە برای شیری و خۆشەویستی منە، وەفاتی شێخی بورهان کە ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی بووە ساڵی لەدایک بوونی منە. لە رووی ئەم ژمارەیە تەمەنی من دەبێتە ٧٨ ساڵ. ئێستاش لە رەحمەتی خوداوە چاوم لە شەوێشدا بێ چاویلکە دەبینێ و گوێم بێ سەمعەک دەبیسێ .و ددانم ساغن .جارجارەش شیعر دەڵێم.

جا برالە ئەو گۆوارە سروە پیرۆزە وەک سفرەیەکی رەنگینە هەرکەسێکی شتێکی خۆش وبەتامی هەبێ دەیهێنێتە سەری و رای دەنوێنێ. ئەگەر من و تۆ چیدی لەسەر هی خۆمان بڕۆین مافی ئەوانی دیکەمان داگیر کردووە .جا واباشە ئی خۆمان بپێچینەوە وبە چوار خشتەکی لالانەوە دوایی بە باس و خواسەکە بێنین .

سکالا و لالانەوە

**ئاکارە ولاپەڕەی رەشم وەک شەوەیە**
**دەرچوون ونەچوونیشم لەد ۆزەخ بەوەیە**
**بەڕووی رەش ومووی سپێ وە هاتوومەتکا**
**بمبەخشی خودا دارونەدارم ئەوەیە**
**صلی اللەوعلی سیدنا محمدوعلی آلەوصحبە**
**وسلمتسلیما**

# مەنگوڕ ٢

## دوکتور جەوادی قازی

ئەم ناوچانەی ئەوان جوانترین ناوچەی کوردستانە ودەتوانرێ لەگەڵ شاخی ئەلپ بەراورد بکرێ.ئەوسروشتە دلڕفێنە یارمەتی ئەوە دەدات خەڵکەکەی تەندرووست و چالاک بن .بەلەشساخی یەکی چاک زۆربەیان دەگەنە تەمەنێکی درێژ.ئەمان زۆر بەدەگمەن خۆیان بە زەوی کێڵانەوە خەریک دەکەن و تەنیا لە سنوورێکی زۆر تەسکدا نەبێ. بۆ بەربڵاو کردنی کشت وکاڵ توانایەکی ئەوتۆیان نیە .یەکەمین شت ئەوەیە کە دانەویڵە لەم هەل ومەرجە ولەسەر ئەم خاکە باش ناڕوێ. دووهەم ئەوەیە ئاژەڵ بەخێوکردن ڕێگەی ئەوەیان نادا کاتێکی زۆر بۆ کشت و کاڵ تەرخان کەن .

هاوینانیان بەوەوە لە دەست دەچێ،کەرانەمەڕەکانیان لە لەوەڕگاکاندا بلەوەڕێنن و ئالیکیش بۆ وەرزی زستان بۆ ئاژەڵەکانیان دابین بکەن. لە بەهاروپایزدا سەوزە ، شیرە،وخەڵووز بۆ فرۆشتن بۆشار دەهێنن وبەوپارەیەی چنگیان دەکەوێ پارچە قوماش وپێویستی ژیانی پێ دەکڕن ،هەر شتێک لەوێ دەستیان بکەوێ ، کە گۆڕان

بەسەر ژەمی نان خواردنەکە-
یاندا بهێنێ .دەستووری هۆز
هێشتا توندوتۆڵە ،بە هەر
جۆرێ بێ لەوەی هۆزە
کوردەکانی دراوسێیان
بەهێزترە .هەر وەکوو چۆن
لەپێشەوە گوتمان،هەر (٢ )
ئاغای تیرەکان
کادەرویشی یەکان ،سەربە
یەک سەرەک هۆزن ، کە ناو
نیشانی مەزنی هەیە . ئەمە
دەبێ لە کۆنترین و
دەمراسترین ئاغاکان بێ
ئەو بە هەڵبژاردن
هەڵنابژێردرێ ، و

## سەرۆک هۆز

هیچ دەسەلاتێکی نابێ
گەر ئاغاکانی تر بەگەورەی
خۆیانی نەزانن . نیشانەی
ئەم بۆ سەلماندنەش ئەوەیە
ئاغاکانی تر سەری لێ بدەن
و بەگوێرەی ئەو داب و
نەریتەی لە سەری دەڕۆن
دیاری یەکی دیاری کراوی
بۆ رەوانە دەکەن . سەرەک
هۆزپایەیەکی بەرزی هەیە و
بەرپرسیاری یەکی زۆری،
دەکەوێتە ئەستۆ. ئەو
بەرامبەر رژیم لەوە
بەرپرسیارە .گرنگترین
باج وسەرانە رەوانە بکا
تاوانبارەکان راو بنێ ،
ئاسایش بۆتاوچەکەی دابین
بکا . هەر ئەویش بۆ
هوزەکەی لەگەڵ هۆزە
دراوسێ یەکاندا ،بڕیاری
شەڕ وئاشتی دەدا ،هەروەها
لە راپەڕین دژی رژێمیش
هەر ئەو دوا بڕیاری
بەدەستەوەیە .

خەبات بەرزترین پلەی
ژیانی مەنگوڕێکە . دەبێ
مێردمناڵێک سواری وتفەنگ
تەقاندن فێربێ . هەر
لەتەمەنی دەساڵی یەوە
سواری ئەسپی دەکەن ، بە
توندی لەزینی شتەک دەدەن
وئینجا لە ئەسپەکەدەخوڕن
ئەو ئەسپەدەست دەکا بە
غاردان وهەڵپەڕین و
دابەزین وچەپۆکان، تا لە
دوایدا لەبەر هیلاکی
رادەوەستێ .ئەوسوارانەی
چاودێری دەکەن بەدوایاندا
دێن ومێردمناڵەکە لەکۆڵی
ئەسپەکە دادەگرن . ئیدی
ئەمە چەند رۆژێک دەخایەنێ
تا ئەو مناڵە ترسی
دەڕەوێتەوە وناچاری فێری
دەکا ،خۆی لەسەر پشتی
ئەسپەکە راگرێ و بەسەر
ئەسپەکەدا زاڵ .ئەگەر
مەسەلەکە مەسەلەی شەڕ
بێ .ئەوە جووتیارەکان کە
ئازادی یان بە قازانجی
ئاغاکانیان بەژێر لێوەوە
کراوە لە ژێر ئاڵای
ئاغاکانیاندا دەجەنگن .
خۆپڕ چەک کردنیان بریتی یە
لە تفەنگ ، زۆربەی
ماوزەڕی ئەڵمانی یە
دەمانچە ،خەنجەر ، هەموو
کەسێک هەمیشە تفەنگی خۆی
پێ یەو چەند رەزنێکیش لە
خۆی دەدا . هەندێ جار
لە شەڕەکاندا ژنەکانیشیان
بەشداری دەکەن ، کە لای
ئەم هۆزە لە زۆر رووەوە
شوێنێکی ئازادیان هەیە ،
وەکوو ئەوە نیەکەلەو وڵاتە
ئیسلامی یەکاندا پاوە، نە
لە"حریم"دا دەژین و نە
چارشێو بەسەردا دەدەن.
زۆرجار لەشەڕوپێک،داداتی
نێوان هۆزەکاندا وای لێ
دێ کە ببێتە شەڕی نێوان
دوو کەڵە پیاو. هەر وەکوو
یەکێک لەو شەڕانە لەنێوان
مەنگوڕوماممەشدا رووی دا .
هەر دوو سەرکردەکە ،سەرەکی
هۆزەکانی خۆیان رووبەرووی
یەک وەستان ،بەڵام هەر
دووکیان یەکتریان کوشت
بۆیە شەڕەکە بەبێ
یەک لابوون بۆهەردووهۆزەکە
مایەوە .ئەوەی لە شەڕدا
بکوژرێ بەرێزلێ گرتنێکی
بێ وێنەوە دەنێژرێ ، کە
لێرەدا ناتوانین بەتان
و پۆیدابچین.بەپێچەوانە-
شەوە ئەوەی بە نەخۆشی یا
لە ئەنجامی پیری بمرێ
هیچ رێزێکی لێ ناگیرێ
ژنان جلی رەشی بۆ لەبەر
ناکەن وناشتنیشی بە بێ
ئاهەنگ گێران دەبێ.بەراورد
کردنی ئەمە لەگەڵ ژیانی
رابردووی ئەوان بەقووڵی
کاری تێ کردم .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە بروایان بە قورئان هەیە هەندێ داب و نەریتی خۆیان هەر پاراستووە. لە سەرەوە باسی ئەوەمان کرد کە ژنەکانیان چارشێو بەسەردا نادەن وحەریمیش لایان بوونی نیە. هەروەها لە مەسەلەی دادگادا ئەم گەلە مۆرکی تایبەتی خۆی وەکوو شتەکانی کەشی بە ئیسلامەوە ناوە.

یاسای ئیسلامی (شەریعەت) لە لایەن داب و دەستوور و نەریتەوە (عورف) تەنگی پێ هەڵچنراوە. لە ئەوەی بۆ لای قازی ومەلا برۆن ئەو دەستانەی بەشەر هاتوون ناوبژی کەرێک هەڵدەبژێرن ئاغایەک بێ یا پیاوێکی ناسراوی بەساڵاچوو. گەر کێشەکە نەتوانرێ یەک لا بکرێتەوە ،ئەوە دەبێ بۆ بەردەم سەرەک هۆز بریاری ئەمیش دوابریار و کۆتایی پێ هێنەرە .لەکێشەی خوێن رشتنیشدا هەر ئەم دەبێتە حاکم. هەر چەند مەنگوڕەکان کۆچەرن، هەر وەکوو کوردەکان بە شێوەیەکی گشتی،پەرۆشی یەکی پەرەسندوویان تێدا بەدی دەکرێ بۆ زانیاری خاوەن قوتابخانەی جۆراو جۆری فێرکردنن ،کەوانەی چاکی زانیاری ئیلامی یان تێدا دەگوترێتەوە .ئەم گەلە گەلێکی گەش وخاوێنە ، کە داهاتوویەک چاوەروانی دەکا .(٦)

١- چەند نووسەرێک بە کورتی دەربارەی د. جەوادی قازیان نووسیوە .

بروانە :د. جەمال نەبەز:کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەلمانیادا، بەرکوتێکی خەرمانەی کورد ناسی لە ئورووپا ، بەغدا ١٩٧٤ ل ٦١ - ٦٢ .

٢- د. جەوادی قازی هەر جارێک بە شێوەیەک ناوی‌خۆی نووسیوە .

٣- بریا نووسەر و روشنبیرەکان لایەکیان لە کتێب و دەستنووسەکانی ئەم کتێبخانەیە دەکردەوە هەندیکیشیان لێ بڵاو دەکردەوە.

٤- مەبەست دەولەتی عوسمانی وقاجاری یە ،بەڵام نووسەر خۆی هەر وای نووسیوە و منیش‌نەمویست دەسکاری بکەم (و)

٥- دەبێ مەبەستی ماست بی (و)

٦- بێ گومان زۆر لایەنی ئەم ووتارە پێویستی بە روون کردنەوەیەکی فراوان هەیە .بەڵام من لەبەر ئەوەی کەرەستەی پێویستم لەبەر دەستدا نیە و دەستیشم بەهیچ شوێنێک راناگا ،بۆیە تەنیا سەرنجی خوێنەرانی ئازیز بۆ " منظومە کردی حمزەرق منگوڕ" رادەکێشم کە لە ئامادەکردن ولێکۆڵینەوە، ووەرگێرانی برایان سەید عبداڵلەصمدی و سەید محمد صمدی یە. ئەم برایانە بەیتەکەی هەمزە ئاغا و لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-یان دەربارەی رووداوی ، کوژرانی هەمزە ئاغا و پەیوەندی ئەو رووداوە بە راپەرینەکەی شێخ‌عبیداللەی نەهری لەساڵی ١٣٦٤ مەهاباد بڵاو کردۆتەوە.

لێرەدا پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش راکێشم کە لە (تحفە مظفریە"دا ، ل ٧٤٢ و ٧٥٩ "بەیتی باپیر ئاغای مەنگوڕ بابی هەمزە ئاغا بڵاوکراوەتەوە. ئەمەش لە گەڵ قسەکانی د. جەوادی قازیدا رێک ناکەوێ وجێگای سەرسوورمانیشە. گەر ئەم قسەیە قسەی کەسێک نەبوایە کە خۆی لەگەڵ ئۆسکارماندا بەیتەکەی تۆمار کرد دەتوانرا چاوی داپۆشرێ بریا برایەکی تر بتوانێ بە بەڵگەی مێژوویی باوەڕپێ کراوەوە ئەم کێشەیە یەک لا بکاتەوە .

**ئەم باسە ئی زور کونە و پیویستی بەلیدوانی تازە هەیە چون ژیانی مەنگور ئال وگوری‌تیدا بەری هاتووە.**

وێدەچێ ئەگەر بلێم کانەبی لەنێو ئاسمانی فۆلکلۆری کوردیدا ئەستێرەیەکی پڕشنگدارە، لە جیهانی پان و بەرینی داستانی کورداندا داستانێکی دڵتەزێنە.

کات گۆنەڵی بەهاری یە، بیتوێنی ڕەنگینی رازاوەیە، گژ وگیا بە مل یەکدا چووە، کەنێرە لە چۆمان خەملێوە پۆڕ دەچریکێنی، بولبول دەخوێنێ، لەبەر دەرکی تاوڵ و ڕەشماڵان بگرە وبەردەی کابانێ، ئێشکەچی شەوێ وەخەبەر دێنێ، ئەسپ ئالیک نەدراوە دەکوڕێنێ، گامێش نەدۆشراوە دەهۆقێنێ، گاوان لەبەر دەرکی ماڵان بەدەستی بەگۆچانەوە راوەستاوە بۆ خڕ بوونەوەی گاڕانێ. تاو هات وزەردە، دوندی کوسرەتی شالەبەگیانی ئەنگاوت ئاونگ لەسەر پەلکی سێپەڕەی بوونە وردە خۆر وکەوتنە پڕشنگ هاویشتن،بەڵام ئاونگ هەر میوانی شەوێ یە و بە ڕۆژ

دەچێتە نێو دەریای ون بوونێ .

بیتوێن هەرێمێکی بە پیت و خاوەن گوند و کشت وکاڵ بوو. کانەبی لە یەکێک لە گوندەکانی ئەو مەڵبەندەیدا دادەنیشت کەناوی ( گوڵەک ) بوو.

کانەبی لە عەشیرەتی ( رەمک )ان بووە، لە بەرەبابی ( فەقێ وەیسی) یان ئەم بەرەبابە بێجگە لە گوڵەکێ چەند دێی دیکەشیان هەبوون وەکوو: ( دەربەند قورەگۆ، هەنجیرە، تۆپاوا ،تۆبەکاران، گرد مەمەند، وڕانگە) .

لە بیتوێنی قەڵایەکیش هەبووە بەناوی ( گردی رەمکان) کە ئێستا وەکوو زوربەی گوند وقەڵایەکانی دیکە نقوومی بن ئاوی ( دووکان)ین . دیسانەوە لە بناری قەندیلی سەربەرز، گردێک هەیە بەناوی گردی رمکان کە لەکاتی گەرمێن وکوێستان کردنیدا جێی حەسانەوەی کۆچ وکۆچباری رەمکان بووە .

رەمک عەشیرەتێکی کەم نەبوون، لە هەر دوو دیوی ئێران وعێراقدا نیشتەجێ بوون لە کوێستانانیش لەزۆر شوێنان بوونە وموڵک وکوێستانیان بووە وەکوو: ( ورمێ،مەراغە ،شنۆ ،خورینج،دلکباش ......)
هاوینە هەواری (پەڵاساوی) جێی راو و شکاری کانەبی ومەشکەژاندنی خوازێ بووە.

داستان بەم شێوەیە دەست پێدەکات دەگێرنەوە دەڵێن:

ساڵێکی لە ساڵان لەبەری زێ یە بادینان مام و برازایەک بەناوی(نەعمان و باندڕ) لە خەلیفەی بەغدایە هەڵدەگەرێنەوە و دەست دەکەن بە راووڕووت و ئەو نێوە نێوەی دەشێوێنن .

خەڵیفەی بەغدایەش کاغەزێکی بۆ عەشیرەتی رەمکان دەنووسێت کە دەبێ کانەبی بەبێ گیربوون بگاتە بەغدایە .

کانەبی لەگەڵ برازایەکی سوار دەبێ و بەرەو بەغدا دەکەوێتە رێ. کات بەهار دەبێ، وەختی لافاو وچۆم ورووبار هەستان دەبێ. مام وبرازا دەڕۆن هەتا دەگەنە سەر زێ یەی بادینان. لەوێ کەڵەکەوان* لەوبەری زێ یە دەبێ.بانگی کەڵەکەوانی دەکەن ئەگەر کەڵەکەکەی بێنیتە ئەوبەری بۆ پەڕینەوە. کەڵەکەوان کەڵەکی بە زێ یەدا دەدا و دەیپەڕێنێتەوە.

کەڵەکەوان پێیان دەڵێ: باشتر وایە کە نەپەڕنەوە چونکە ئەوبەری دوو رێگری لێ هەن ناویان نەعمان و باندڕە، کەسیان لەبەر دەست رزگار نابێت، ئەگەر دەست نەدەن رەنگە هەر بشتانکووژی .

کانەبی بە کەڵەکەوان دەڵێ: برالە ئەتۆ بمانپەڕێنەوە ئەمە لەوبەری چارێکی خۆمان دەکەین و خودا گەورەیە .

زینی لە وڵاخان دەکەنەوە ودەیان هاوینە سەر پشتی کەڵەکی و وڵاخانیش لە زێ یەکە دەکەن و وەپێش کەڵەکەیان دەخەن ولەسەر کەڵەکەیرا کلکیان دەگرن و دەنگیان دەدەن، هەروەک بە مەقەستی ببرێ زێ یەکە دەبڕن ودەگەنە ئەوبەری.
لەوبەری دەستاوبرد وڵاخان زین دەکەنەوە و سواریان دەبن وهیندێکیان دێنن و دەبەن وگەرمیان دادێنن و وشکیان دەکەنەوە.

نەعمان وباندڕ چاویان لێ دەبێ . ئەوانیش سواری وڵاخان دەبن و هەڵیان دەکوتنە سەرێ و داوای چەک و وڵاخیان لێدەکەن ( کوڕە رووت بن و کوڕەرووت نابم) پەیدا دەبێت . کانەبی پەلاماری نەعمانی دەدا و برازایەکەشی پەلاماری باندڕی ودەبێتە مەیدان. زۆری پێ ناچێ برازای کانەبی پشتی لەباندڕی دەستێنێ و دەیکوژێ. پاش ماوێکی کانەبیش پشتی لە نەعمانی دەستێنێ و رمبێکی لێ دەداو بەسەر گوێی وڵاخیدا هەڵیدەدێری .

نەعمان بە برینداری بانگی کانەبی دەکات ودەڵێ : هەتا نەمردووم وەرە تا ئامۆژگاری یەکت بکەم. ئەتۆ پاڵەوانێکی چاکی با بەخۆڕایی نەڕۆی.

کانەبی لە نەعمان دەچێتە پێش و نەعمان بەدزی دەمانچەی دەردێنی،دەمانچێکی جووت قەرەبینا لە کانەبی ئاور دەدا و کانەبیش بەسەر نەعماندا دەکەوێ و هەردووکیان لەوێ بەسەر یەکدا دەمرن .

برازایەکەی کانەبی هەر لەوێ گۆڕێکی هەڵدەکەنێ و کانەبی دەنێژێ وبەکەڵەکی دەپەڕێتەوە ویاڵ وکلکی وڵاخان شین دەکا و جلکی کانەبی بەسەر وڵاخیدا دێنێ و سواری وڵاخی خۆی دەبێ ووڵاخی کانەبیش بەدوای خۆیدا رادەکێشی و بەرەو بیتوێن دەگەڕێتەوە .

کاتێکی کۆتەڵی کانەبی دەگاتەوە گوڵەکە شین وگریان دەست پێدەکا . لە دەری ماڵان رەشماڵێکی لەسەر هەژدە ئەستوندان هەڵدەدەن، لایەکی بۆ میوانان و لایەکەی دیکەشی بۆ تێکەوڵێکەی ماتەمینێ. ئەسپی کانەبی دەرازێننەوە ، جلەکانیشی دەکەنە کۆتەڵ وسواری ئەسپی دەکەن ، شایەر ودەنگ خۆشی ئەو نێوە نێوەش وەکۆ دەکەن و جڵەوی ئەسپی بە بەر ماڵاندا رادەکێشن ودەست دەکەن بە پێ هەڵگوتنێ .

ژنەکەی کانەبی کە ناوی خوازێ دەبێ سەری خۆی شین دەکات و بەدوای ئەسپیدا دەڕوا وبەدەنگی خۆش ودەروونی پڕ لەجۆش وکوڵ وگریانی ئەو بەندانە دەڵێ :

لەوێ کاوێ ، لەوێ کەونە کاوێ
رمبی کانەبی سەری لەعەرزی بنی لەئاوێ
یاڵ وبژی ئەسپە شێ ی بشۆن بەگوڵاوێ
مەیتەر بیکاتەوە رنەکێ،کارەکەر بیداتەوە شەواوێ

لە ئەستۆی خوازێ بێ وەک مانگی رەمەزانێ
شێ یە دەرنەهێنێ لە گەردە خاوێ
کانەبی رۆ،راوکەری خورنج وپەلاساوی
لەوێ کاوێ،لەوێ کەونەکاوێ، لەوێ تەکۆمێ

پیاوێکی باشی
پارەکەینێ ئەوان مەجالان،خواز قایل
نەدەبوو نە بەکەتانی نە بە قوماشی
بەلاّم ئەوسالّ کەس راناگری نەبە کارەکە-
ری نە بە قەرەواشی
کانەبی رۆ، بەجێی هێشتن خزم ودۆست و
وێلّداشی

* * * *

چوومە مالّە کانەبی،نە مالّ بوو نەمالّی
دەجاران
نەرمە توزێک کەوتبوو لەسەر ئەوان چیغ و
رەشمالاّن
کانەبی رۆ،شۆڕە سوار وشێرەکە لەنوالاّن

* * * *

دایکی نەعمانی کە دەزانێ نەعمان
کوژراوە دێتە سەر تەرمەکەی و زۆری
پەرۆش دەبێ بەلاّم زۆرتریش پەرۆشی
ئەوەی دەبێ کە کوڕەکەی دەبێ بەدەست
چ پیاوێکی هیچ وپووچی خوێری کوژرابێ.
بۆیە بڕیار دەدا ئەگەر بەدوای کوژەری،
کوڕەکەی بکەوێ لەدوای ناشتنی نەعمانی
شوێن بەشوێن ودێ بە دێ دەکەوێتە رێ
هەتا بە پرسیاران دەگاتە گولّەکێ . لە
گولّەکێ ئەگەر چاوی بە بەرودیوەخان و
کۆتەلّ و شینگای رەمکان دەکەوێ، دەزانێ
کوژەری کوڕەکەی پیاوێکی خانەدان و
عەشیرەت وپالّەوان بووە، بۆیە لەوێ خۆی
ئاشکرا دەکا و لەگەلّ وان دەکەوێتە
شین وگریان و بە ناسینی رەمکانیش
کەمێکی غەم لەسەر شانی سووک دەبن .
زۆرکەس بە کانەبی یان هەلّگوتووە،
سەپان زۆر جاران لەکاتی دروێنەی
بەکرەییدا ئەو بەندەی دەلّێن :
کانەبی دەلّێ هەو هەوە
شیرنە دەست و جلّەوە
نەعمان بۆم وەدەرکەوە.......

قەت نەبووە لەداراتی زەمانان شێرێکی.
وەکوو کانەبی لەبەر خانی ئەحمەد خانی
«بێناسێ» بچۆمێ .
کانەبی رۆ،لەمن بوو بە بەردی بن گۆمێ

* * * *

کانەبی بۆ عێل وعەشیرەتی خۆت چەند

بازاری بۆکان :دیاری وێنەگەری نیگار

مێژووی هەر شارێک پێویستی بەکتێب و نووسراوە و سەرچاوەی متمانەپێ کراوی وەک : لێکۆڵینەوە ودۆزینەوە و کۆنینەناسی هەیە کە بەداخەوە لەسەر بۆکانیش وەک زوربەی شارەکانی دیکە بەرجی کۆن بوون ولەمێژینەیی مێژوویەکی نووسراوە نیە و لێشی نەکۆڵدراوەتەوە.

دیسانیش زۆر سەنەد و بەڵگە و شاهید هەن کە کۆن بوونی ئەم شارە دەسەلمێنن وەک کانیاو و رووبار کە بنووسی کۆبوونەوەی مرۆقە وهەروەها گۆڕستانی پێش ئیسلام وتەپۆڵکەی خۆڵەمێش کە نیشانەی ئاورگەی دەوری زەردەشت بووە و تەندوورو گۆری گوری زۆر لە دۆڵ و دەرەی ناوچە دیاردەی مێژ- ینەی ئەم شارەن.

لە بابەت پەیدابوونی ناوی بۆکانەوە قسە زۆرن ئێمە لێرەدا چەند بیر و بۆچوونی جۆراوجۆر باس دەکەین.

بۆکان لەپێشدا شارەکۆن بووە کە لە جەنووبی رۆژئاوایی بۆکان شارەکۆن هەیە و بەهۆی بوولەرزە کاول بووە وخەڵک پاشان بۆکانی ئێستایان بنیات ناوە. زەمانی ناسرەدین شای قەجەر عەزیز خانی سەردار بۆکانی لە مەردان بەگ کریوە. بۆکانی ئەو سەردەم سەد ماڵ بووە. عەزیزخان بۆ ئاوەدانی بۆکان زۆر حەول بووە و لەسەر تەپۆڵکەیەک قەلایەکی جوان ورەختەی ساز کردووە.

سەید عوبەیدیللا ئەیبووبیان لە بابەت بوکانەوە لە سەر ئەو بروایەیە کە بوکا ن لە دوو وشەی بو بەمانای ولات و کان بە مانای مەعدەن پیک هاتووە و بە هوی زوربوونی ئاووهاوینی فینک و زستانیجگەرم ناوی بوکانیان لە سەر ناوە قەدیم وا باو بووە کە زەماوەندی بۆکان وگوندەکا -نی دەوری لەسەر کانی مەردان بەگکراوە و بۆیە ناویان ناوی کانی بووکان. دوایەش وردە وردەکانی یەکە کورت بۆتەوە و سواوە و بووکان ماوەتەوە.

یا دەڵێن زۆر جار وا بووە کە چەند بووک وێکڕا هاتوون پێیان گوتووە، بووکەکان. بەڵام چون راوێژ ی ولەوو خۆشترە بووەتە بۆکان.

هێندێک بۆکان بە

وشەیەکی مەغوولی دەزانن .
وەختێک مەغوول هێرشیان هێناوەتە سەر ئەم ناوچەیە ولەگەڵ بەربەرەکانی توند وتیژی خەڵک بەرەورووبوون وزۆر توورە بوون وتەنانەت ناوی گوندەکانیشیان گۆڕیوە وەک ناچیت ، حەمامیان ئۆچتەیە ، کۆڵ تەپە . ئەودەم بۆکان لە هەموو دێ و گوندی دەوروبەری خۆی گەورەتر بووە وپێیان گوتووە ، بیکەندیانی گوندی گەورە . دوایەش وشەکە سواوە و بۆتە بۆکان .

بۆکان لەلای رۆژهەڵاتی سیمینەڕووده و ٣٤ کیلۆمێتری سەددی نەورووزلوو کە لەسەر زەرینەروود هەڵبەستراوە ،رۆژهەلات و رۆژئاوا و جەنووبی بە بەرزە کێوی تاک تاکە گیراوە کە لە زنجیرەکێوەکانی زاگرۆس جیا بوونەوە .

ئاو و هەوای بۆکان زستانان سارد وبەفراوی یە وهاوینان گەرمە .بەهارەکەی پڕ باران وپایزەکەی پڕ بایە ونیوەی زستان بڕست بڕە بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە خەڵکی ناوچە نین .

زستانی بۆکان درێژە و لە ئاخر و ئۆخری خەزەڵوەرەوە دەست پێدەکا و تا نیوەی مانگی خاکەلێوە دەخایەنێ . بەرفی قورس و هەوای سارد بۆ ماوەیەکی زۆر کاروکسبی خەڵک مەحتەل دەکا .

**باری ئابووری**

بۆکان لە تەبیعەتکەڵک وەردەگرێ و بە ئەمباری رسقی ئازەربایجان ناوبانگی دەرکردووە و زێدە حاسڵی کشت وکاڵی خۆی وەک گەنم و جۆ وگوڵەبەڕۆژە و گەرمەشانی ودانەوێڵە بۆ ناوچەکانی دیکەی وڵات دەنێرێ .

زەمانی ناسرەدین شای قەجەر کە سەردار عەزیز خان بوو بە فەرماندەی قشوونی ئێران لە بۆکان بنەگر بوو چون بنکەیەکی بەرێ کردنی گەنم بوو. ئێستاش چەشنە گەنمێک بە ناوی ، گەنمی سەرداری یا یەکشەوە بەناوبانگە و قەدیم بۆ نانی شا قەجەرەکان کەڵکی لێ وەردەگیرا .

بەرجی ئەوە لەباری ئاژەڵداریشەوە بە ئێرووییە و ئاژەڵی بۆباقی مەڵبەندەکانی وڵات بەرێ دەکرێ .

**باری جوغرافیایی**

شاری بۆکان بەپێی ژمێرەی ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی ٢٣٥٠٠ کەس بووە. ئەگەر ناوچەکانی دەوروبەریشی بێتە سەر دەبێتە سەدهەزار کەس . لەباری دابەشینی وڵاتەوە بەشێکە لە مەهاباد و لە ئازەربایجانی رۆژئاوا هەڵکەوتووە. جا بەپێی زۆر بوونی خەڵک وسەربەخۆبوونی ئێدارەکانی پێویستە لە بەخش بکرێتە شارستان کە ئەوەش ویستی هەموو چین و توێژی خەڵکی ئەم مەڵبەندەیە

مەودای بۆکان لەگەڵ مەهاباد ٦٥ کیلۆمێترە ولە نێوەڕاست ڕێگەی میاندواو ، سەقزە. لەسەر نەخشەی جوغرافیا بەم شێوە دەدۆزرێتەوە :

درێژایی ٤٦ دەرەجە و ١٣ دەقیقە .

بەرینایی٣٦ دەرەجە و ٣٢ دەقیقە .

بەرزایی ١٣٧٠ مێتر.

جیاوازی لەگەڵ سەعاتی تاران ٢٠ دەقیقەو٤٢ سانیەیە

لە رۆژهەلاتەوە بە سەددی نەوروزلوو و ناوچەی سانیدژەوەیە. لە رۆژاواوە، بە دەوروبەری مەهابادەوەیە. لە جەنووبەوە بە سەقز و ئوستانی کوردستانەوەیە .لە شیمالەوە بەمیاندواوەیە.

**باری فەرهەنگی وسیاسی**

خەڵکی بۆکان بە کوردی داخێون وموسڵمانن.رێڕەوی ئیمام شافعین. زۆر بەدڵ و دەروون وخۆش ئام وشۆن . دلبەندی یان بە کتێب و موتاڵا زۆرە.

شاعیر وهونەرمەندی زۆر لێ هەڵکەوتووە کە خزمەتێکی زۆریان بەفەرهەنگ و ئەدەبی کوردی کردووە. وەک :

مەلا مارف کۆکەیی عەبدوڵڵا بەگ ( میسباحو

دیوانی ئەدەب)ئەحمەدی کۆڕ ماموستا حەقیقی و سوارەی ئیلخانی زادە.

زانا وشەرع زانی وەک مەلا عەلی قزلجی و مەلا عیسا مەدینی شەفیعی .

گوندستێنەکانی بۆکان بریتین لە:

ئاختەچی، یالٚ تەمر .

ئیل وعەشیرەکانی بۆکان بریتین لە:

بەگزادە ،دێبۆکری،گەورک

**شوێنەواری مێژوویی وسێرانگەی بۆکان :**

١ـ تەپەی تابانی لە گوندی ئەحمەداواوە سەربە دەورە پارت و ساسانی .

٢ـ تەپەی ئاشە کۆن لە گوندی ئەحمەداواوە سەربە هەزارەی یەکەمی پێش میلاد.

٣ـ گردی ملکاوی لە گوندی باخچەی بێهی سەربە هەزارەی پێش میلاد .

٤ـ گردی شێخانی چووکە لە گوندی ساروقامیش .

٥ـ گردی شێخانی گەورە لە گوندی باخچە .

٦ـ بورجی تیکان تەپە.

٧ـ گردی کولتەپە.

٨ـ قەلای تەپێ لە گوندی تەپێ .

٩ـ قەلا کۆنە لە گوندی ئالٚبلاغ .

١٠ـ گردی قەرەکەند.

١١ـ گردی رۆژبەیانی .

١٢ـ گردی داربەسەر .

١٣ـ زەوی جەرە لە گوندی شێخەر

١٤ـ گردە خلیسکە لە گوندی سەراو .

١٥ـ گردە خەزێنە لەگوندی سەراو .

١٦ـ گردە شین لە گوندی سەراو.

١٧ـ گرداش لە گوندی قەرەمووسالو .

١٨ـ گردی گوێکتەپە لە گوندی گوێک تەپە .

٢٦ـ گردی عەولا تەپەسی لە گوندی عەولا تەپەسی .

٢٧ـ گرد مالان لەگوندی کۆنە مەلٚلا لەر .

٢٨ـ گردی عەرەبلوو لە گوندی عەلی کەند.

٢٩ـ گردی سەردار لە سەردەرئابات .

٣٠ـ قەلای سەردار لە شاری بۆکان .

**سەیرانگە :**

**چەمی بوکان:دیاری ئیسماعیل‌الح‌زادە**

١٩ـ گردەشین لە گوندی رەحیمخان .

٢٠ـ گردمەحموود لە گوندی ئەرمەنی بلاغی .

٢١ـ گرد وسمان لەگوندی قورمیش .

٢٢ـ گردی کانی کووزەلە .

٢٣ـ قەلای ناچیت .

٢٤ـ گردی کوورەخانە لە وشتەپە .

٢٥ـ گرد مەخسود لە مەلٚلا لەر.

سەدی نەوروزلوو، باغی میراوا ـ پێدەشتی سەردەر ـ ئابات و حاجی کەندـ حەوزە گەورە ـ ئەشکەوتی قەلایچی ئەشکەوتی کۆلٚ ئابات ـ قەلای سەردار ـ کونە کۆتر ـ کونە مالان ـ ئەشکەوتی موکری قران ـ مزگەوتی جامیعەی بۆکان ـ مزگەوتی حەمامیان.

## تەنزی کۆمەڵایەتی

# قازۆ ٧

٢

قازی ئەحمەد

بەدڵ شکاوی جێم هێشت .
منی ئەوسنی زگ زل شەوو رۆژ
چاوم لە درگا بوو. بەڵکە
گۆشت قازم بۆبێ . نەبوو کە
نەبوو! پاش ماوەیەک لەبیرم
چۆوە و وازم هێنا .

ئەمرۆ کاتێک سەحەر خانم
باسی قازەکەی کرد هاتەوە
بیرم کە بەڵێ قازێک لە
فریزەری خانمدا بۆرۆژی ڕەش
هەڵگیرابوو. ئێستا لاشی
بۆگەن بووە ولە فریزەر تووڕ
هەڵدراوە وخانمیش وەک توڕی
لەسواری هەڵدێرابێ وملی شکا
بێ،بۆی بە پەرۆشە وشینی بۆ
دەگێرێ ! لەدڵی خۆمدا
سوپاسی خوام کرد. ڕووم دە
سەحەرخانم کرد گوتم :

" هیچ نەقەوماوە. خۆت
سڵامەت بی! خوا بە ڕسقی
نەکردبوو! فەرموو! فەرموو!
شورەیی نیە بۆ قازێک ئەو
هەنگامەیەت بەرپا کردووە!؟"

هەرچونێک بوو بە نەرمە
پاڵەستودان بردمەوە ژوور.لە
سەر کورسیلەیەک دانیشتم و
دەستم کرد بەدڵخوشی دانەوەی
بەڵام ژیربوونەوەی نەبوو .
ئەوی دەیگوت نەی دەگوتەوە .
بەگریانەوە دەیگوت :

" ئەی فریزەرم خەرا بووا
قەت گۆشتم نەما لەگۆشتە -
وارێ!! ئەی یەخچاڵ بەتاڵ
خۆم ! ئەی بێ گۆشت کفتە خۆم
ئەی قازە ڕۆ! ."

خەریک بوو تووڕە دەبووم.
ئاخر منی ئاشقە فەرهەنگ کە
ئەویندار زبان و فۆلکلوری
کوردیم چون دەتوانم ئیزن
بدەم فۆلکلۆری کوردی
دەسکاری بکرێ . گوڕاندم و
گوتم :

" خانم ئاگات لە زبانت
بێ ! بۆچی قسەی پێشینیان
تێک دەدەی !؟"

بە کرووزە کرووز پرسی :

" چم کردووە ؟ من بۆ قاز
دەگریم باوکم! من چی وقسەی
پێشینیان چی ؟"

بە تووڕەیی یەوە گوتم :

"خانم دەبێ بڵێی، بابانم
خەرا بووا! قەت کەسم نەما لە
شوینەوارێ نەک قەت گۆشتم
نەما لە گۆشتەوارێ !"

وەک لێم حاڵی نەبووبێ گوتی:

" حەق بەتۆیە هەمەوەند
گیان . لەبیرمە زۆرت ئیشتیا
لە گۆشت قازەکە بوو منیش
نەمدایەی! حەقتە! بە خوا
هەرچی بڵێی حەقە! ئەوەتا
ئەو گۆشتە جوانە، ئەو سینگە
پانە، ئەو ڕانە قەڵەوانە
دەبێ بچنە بن گڵێ! دەک
لالاییم گاتێ! دەک نەمێنم
هی! هی! هی!"

ئەوەی گوت و خۆی لە

لە کاولە لەحسیایە کەلاکەکەی بهێنیەوە..." وەک قسەم بۆ دیواری کردبێ. سەحەر خانم هیچ جوابی نەدامەوە وهەروا درێژەی بە بەیتەکەی دەدا:

ومن هیچ نەڵێم! بەڵام لە نەکاو عەقڵم هاتەوە بەرخۆم. لە دەروونی خۆمدا دەخۆم ڕاخوڕیم. هەیاران نەکەی لۆمەی سەحەرخانم بکەی! نا

ڕەبی بەرپرسی ئیدارەی کارەبا
ئەگەر نانت هەیە دۆت نەبێ
ئەگەر دۆت هەیە دینت نەبێ
ئەگەر دینت هەیە ئیمانت نەبێ
دەبڕو نەحلەتی خوداو ڕەسوولانت لێ بێ
ڕەبی ئەگەر ئاوت هەیە بەرقت نەبێ
ئەگەر برینجت هەیە ڕۆنت نەبێ
ئەگەر تایدت هەیە سابوونت نەبێ
ڕەبی پەیکانی ژێرت مەیت هەڵگرت بێ
جێگات لە دنیا وقیامەتان زمهەریر بێ
گۆشتیماڵە تۆش بە دەردی،
قازۆی من چێ
هەی قازۆ مەڕۆ لەمنی بەتەنێ
دیسان خەریک بوو توڕە بم بەیتی سوارۆ ئاوای بەسەر بێ

نەکەی! ئەم قازۆیە کە ئەو وتویەتی شاکارێکە! مەگەر کارێکی هونەری گرینگ بەچی دەڵێن؟ چریکەی خەج وسیامەند یان دمدم ولاسەشۆڕی باڵەکی کە ئەمڕۆ بەشاکاری ئەدەبی کۆنی کورد دەناسرێن لەچ حاڵ وهەوایەکدا گوتراون؟ بێ گومان لەکاتێکدا کە وێژەر، لە هەل ومەرج وحاڵەتی ڕەوانی سەحەرخانمدا بووە .

سوارۆ چۆتە شەڕ و گوژراوە دلدارەکەی شێت وشەیدا بووەو چریکەی سوارۆی گوتووە! ئێستا ئەم چەشنە سەوداسەری و ئەوینە کە کچێک بۆکوڕێک یان کوڕێک بۆ کچێک شێت و شەیدا بێ ورو لە کێوان کا و چریکەی بەسۆز بڵێ نەماوە .لە زەمانی ئێمەدا زار و زگ مەسەلەی گرینگە وئادەمیزاد بۆ گۆشت وبرینج هەڵوەدایە

وپیاوی بۆ دەکوژێ وچریکەی بە سۆزی بۆ هەڵدەبەستێ! لە زەمانی زوودا دڵ ودڵداری و ئەوین دەبوونە هۆی سەوداسەری وشەیدایی وهەڵبەستنی چریکەی بەسۆزی ئاگرین .ئەگەر وایە سەحەرخانم گلەیی لەسەر نیەو بەیتی "قازۆ"ش دەچێتە ڕیزی چریکەکانی گەل ونیشاندەری هەل ومەرجی تایبەتی زەمانی خۆیەتی .خۆم بەو دەلیلانە ڕازی کرد وڕەخنەم لە سەحەر خانم نەگرت.

بە پەلە هەستامویەک سەر چوومە بازاڕ وقازێکی قەڵەوم کڕی وگەڕامەوە ماڵی سەحەر خانم. قازم بە قاڕە قاڕ وەژوور خست وهاوارم کرد:

"سەحەرخانم مزگێنی بێ، تۆپەڵ وتۆپەڵە قازەکەت لەوێ سوکە سەفەرێ هاتەوە! بەڵام بۆخاتری خودا ساڵەکەی ناسکە ساڵە ئەوەش بۆگەن مەکە و بۆ نەهاری سبەینێ بۆمان سازکەوە موتەنجەنە،هەرامەتی دەگەڵ پلاوێ!"

تا ئێستا کە ئەو چیرۆکە دەنووسم خەبەرێک لە نەهار نەبووە! و خودا دەزانێ قاز چی بەسەر هاتووە. ئەگەر ئەوەش بە مەرەدی قازەکەی دیکە چووبێ قەرار بێ منیش چریکەیەک بۆئەوەیان داڕێژم کە"سوارۆ"ی سنجانێ و"قازۆی" سەحەرخانمی لە مزگێنی بدەن:

بۆچی دڕدۆنگ و شێواوی
چ ئازارێک دەورەی داوی
تۆ نەتدیوە سوێری و تاڵی
بێ ئەزموونی ، کرچی ، کاڵی
راستە ئێستا ناوم نیە
کەلاوەم و باوم نیە
دەورانێکی من ئاوا بووم
پێت وانەبێ هەر ئاوا بووم
سەرم لە تەشقی هەوران بوو
دەروازەم بواری گەوران بوو
بەڵی گەلێک گەورە گەورە
لێم داسەکنیون بەدەورە
گەلێک خانم لەسەر بوونە
گەلێک سوارم هەڵداشتوونە
دیومە قاتی و بوومەلەرزە
بەلام هێشتا سەرم بەرزە
مەل پرسی قەڵای بێ ئە*نوا
ئەی ئاسەواری بوونت کوا ؟
دەڵێی ئێرە قەڵا بووە
بەچی ئاوا تێدا چووە
ئاخر کوا مێر و مێر خاسی
کوا حەوز و کوا تات و تاسی
کوا بێلا، کوانێ گوێسوانەی
کوا مەیتەر، یەخترمەخانەی
کوا زەنا زەنای هات و چوون
کوانێ لەنجە و لاری خاتوون
لەکوێن گزیر، میراو، چاچی
دەست بە شیر و تیر و چاچی*
کوا دایەن و نەنێ و دادە
خان و خاتوون و خانزادە
کوان ماقووڵ و ردێن سپی
بۆ زاڵە بێدەنگی و کپی ؟
پەڕیوەی کام شوێن و هەردن
بناخەی کام شوورە و بەردن
لێی هاتە جواب کۆنە قەڵا
تۆ نەتدیوە کۆسپ و بەڵا

دونیا زور بە پێچ و دەورە
شەوە ، رۆژە ، ساوە ، هەورە
خودا لەو بەرزایی و بەستە
نەردیوانێکی بەدەستە
باڵەفڕکەی بەرەو بەرزی
گاسن چاکردن لە دەرزی
چوونە خوار بەرەو نزمایی
رووناکایی ، تاریکایی
هەر لە قودرەتی ئەو دایە
بۆم بانادری ئەو هەودایە
بێتوو ئەو مەیلی لەسەر بێ
خێوم لەبۆ دەستە بەربێ
میعمار تەرحم دابڕێژن
کلۆ و سندەم دابێژن
بەچاو لەسەریەک دانانێک
بە روانین و تێڕامانێک
دەبمەوە جوانی دونیایە
چاو لەبەر جوانیم هەڵنایە

# کەلاوە

## ح. رەشیدی زەرزا

بالندێکی لەخۆ بای*ی
خولی دەدا لە بەرزایی
گشت لایەکی دەکرد بەدی
کۆنە کەلاوێکی دەدی
چوار دیواری هەرەس هێناو
تێک قرماو ، تێک تەپیو، رووخاو
تاقە و میچ وبانی کاولاش
پووش و پەلاش لەوێ بەلا*ش
نە جریوە ونە سریوە و دەنگێ
نە وێنە و دیمەن و رەنگێ

چۆل و هۆل و بێدەنگ و هەست
وەک لە غوڕاب*ی خەودا مەست
زۆری لەسەر خول و سوڕدا
بیری کۆنی لە دڵ گڕدا
لە نەکاو پرسی ئەو جێیە
مەکۆی فیز و هەوای کێیە ؟
هێشتا هەر گوێی دەزرینگاوە
کەلاوە کۆن جوابی داوە :
هۆ ! بالندە نەکەی نەچی
پێم بێژە دەگەڕێی لەچی ؟

بۆچی دڕدۆنگ و شێواوی
چ ئازارێک دەورەی داوی
تۆ نەتدیوە سوێری و تاڵی
بێ ئەزموونی ، کرچی ، کاڵی
راستە ئێستا ناوم نیە
کەلاوەم و باوم نیە
دەورانێکی من ئاوا بووم
پێت وانەبێ هەر ئاوا بووم
سەرم لە تەشقی هەوران بوو
دەروازەم بواری گەوران بوو
بەڵی گەلێک گەورە گەورە
لێم داسەکنیون بەدەورە
گەلێک خانم لەسەر بوونە
گەلێک سوارم هەڵداشتوونە
دیومە قاتی و بوومەلەرزە
بەلاّم هێشتا سەرم بەرزە
مەل پرسی قەلاّی بێ ئەنوا*

ئەی ئاسەواری بوونت کوا ؟
دەڵێی ئێرە قەلاّ بووە
بەچی ئاوا تێدا چووە
ئاخر کوا مێر و مێر خاسی
کوا حەوز و کوا تات و تاسی
کوا بێلاّ، کوانێ گوێسوانەی
کوا مەیتەر، یەخترمەخانەی
کوا زەنای هات و چوون
کوانێ لەنجە و لاری خاتوون
لەکوێن گزیر ، میراو ، چاچی
دەست بە شیر و تیر و چاچی*
کوا دایەن و نەنێ و دادە
خان و خاتوون و خانزادە
کوان ماقووڵ و ردێن سپی
بۆ زاڵە بێدەنگی و کپی ؟
پەرێوەی کام شوێن و هەردن
بناخەی کام شوورە و بەردن
لێی هاتە جواب کۆنە قەلاّ
تۆ نەتدیوە کۆسپ و بەلاّ

دونیا زور بە پێچ و دەورە
شەوە ، رۆژە ، ساوە ، هەورە
خودا لەو بەرزایی و بەستە
نەردیوانێکی بەدەستە
باڵەفڕکەی بەرەو بەرزی
گاسن چاکردن لە دەرزی
چوونە خوار بەرەو نزمایی
رووناکایی ، تاریکایی
هەر لە قودرەتی ئەو دایە
بۆم بانادری ئەو هەودایە
بێتوو ئەو مەیلی لەسەر بێ
خێوم لەبۆ دەستە بەربێ
میعمار تەرحم دابڕێژن
کلّۆ و سندەم دابێژن
بەچاو لەسەریەک دانانێک
بە روانین و تێڕامانێک
دەبمەوە جوانی دونیایە
چاو لەبەر جوانیم هەڵنایە

# کەلاوە

ح. ڕەشیدی زەرزا

باڵندێکی لەخۆ بایی*
خولی دەدا لە بەرزایی
گشت لایەکی دەکرد بەدی
کۆنە کەلاوێکی دەدی
چوار دیواری هەرەس هێناو
تێک قرماو ، تێک تەپیو، رووخاو
تاقە و میچ وبانی کاولاش
پووش و پەڵاش لەوێ بەلاش*
نە جریوە ونە سریوە و دەنگێ
نە وێنە و دیمەن و ڕەنگێ

چۆل و هۆل و بێدەنگ و هەست
وەک لە غوڕابی* خەودا مەست
زۆری لەسەر خول و سوڕدا
بیری کۆنی لە دڵ گڕ دا
لە نەکاو پرسی ئەو جێیە
مەکۆی فیز و هەوای کێیە ؟
هێشتا هەر گوێی دەزرینگاوە
کەلاوە کۆن جوابی داوە :
هۆ! باڵندە نەکەی نەچی
پێم بێژە دەگەڕێی لەچی ؟

سەهۆلان هیچ نووسراوەیـــەکــی تەواومان بەلاوە نیە تا بلاّوی کەینەوە. دەتوانی بۆمانی بنێری

**مەهاباد:** لوقمانی محەممەدزادە

نۆرەی هونەرمەندی وەک کاک محەممەدی مامڵێ و... دەگا و باسیان دەکەین .

کەمتاکورتێکیش تـــاریخـــی کوردستان لە سروەدا جاروبار خۆ دەنوێنێ.

لەمەر تاریخچـەی ژیانـــی حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان وعەلی( سەلام و دروودی خوایان لێ بێ) هیواداریـــن وەختی خۆی مەتڵەب بنووسین .

**نەغەدە:** کەریم عەبدی

برای بەرێز تا ئەوجێگەی بۆمان بلوێ وێنەی رەنگی چاپ دەکەین .

چونکە گۆواری سروە فەرهەنگی ئەدەبی یە ناتوانین وتاری سیاسی تێدا بلاّو کەینەوە .

**ورمێ:** کاک رەحمان ئەحمەدی

زۆر جێگەی داخ ودەردە کە براکانت بەشە مالی خۆت بو دیاری ناکەن ودەگەڵت ناسازێن. زۆرن ئەو برایانەی بۆ مالـّی دنیا دەست دەرووی یەکـــدی دەنێن وبەشی یەکتر دەخۆن وئەو پەندە لەبیر دەبەنەوە کە:

"مالّی دنیا دەبێتەوە برا نابێتەوە."

ئەگەر بەقسەی ئێمە دەکەی شکایەت بکە وشاهیدان کۆکـــەوە و کارەکەت بەرە دادگا و لـە رێگەی قانوونەوە دەست بەکاربە دیارە لەپێشدا بەزبانی خـــۆش و برایانە داوای بەشی خـــۆت دەکەی وئەگەر نەیاندایەی دادگا و قانوون بۆ رۆژی وا دەبـــێ و دەتوانی بەشی خۆت بستێنی.

**بۆکان :** برایان کاک عومـــەرێ گەوهەری ورەئووفی عەلیار:

بەڵێ مامۆستا هێمن کوری ، هەیە بەلاّم وەک باوکی خوالێخۆ شبووی شاعیر نیە .کتێبی تاریک و روون قاچاغ نیە بەلاّم چاپی تەواو بووە ودەست ناکەوێ .

عەکس وپەندەکانمان بۆبنێرن تا ئەگەر باش بوون کەڵکیـــا ن لێ وەرگرین .

**بۆکان :** مستەفا شوکرە

برای بەرێز "چارەنـــووس داستانێکی کۆن و فولکلوری یـە و کەس نەینووسیوە. بـۆیــــان ناردووین.

دیوانی مەحوی مان بـــەلاوە، هەیە بەلاّم تایبەتی کتێبخانە و ئارشیوە وناڤرۆشرێ.

**تاران:** ئەحمەدی عەلیزادە

شیعرێکی کاک حەسەنی ســـەلاح ( سۆران)ت بۆ ناردبووین کـــە بە چەند هۆ بلاّومان نەکردەوە. یەکەم لەباری وەزنەوە شیعرەکان لەنگن.

دووەم: نازانین کاک "سۆران" رازی یە یا نیە. ئەگەر رەزای شاعیری لەسەرە تکایـە شیعـــری جوانترمان بۆ بنێرە تا بلاّوی کەینەوە .

**سەردەشت:** کاک قادر شێخی

ناوی شاعیری ئەم شیعرانەت نەنووسیوە چون شیعری خـــۆت نین و زۆر مەشهوورن. تکایـــە ئەوجار کە شیعرت بۆ ناردیـــن ناوی شاعیرەکەشی بنووسە.

سەرکەوتووبی .

**نامە ودیاری ئەمئازیزانەشما ن پێگەیشتووە. پڕ بەدلّ سپاسیـــا ن دەکەین .**

سنـە : **تۆفیق مـــەحمـــوودی ئەبووبەکر عیشقی ـ ئیسماعیل .گ .**

مەهاباد: **چیمە ن .ک ـ فەرهـاد جەها ن میهەن ـ خەلیل نیرووەمەنـد ع.ج. شیوا و ـ سەلاح گوڵەندامـــی موحەممەد هونەرمەند ـ شەدیهقانی**

نەغەدە : **حەسەن خدر زادە ، عومەر عەبدی ـ مرادزایر ـ عوسمان مەولوودی ـ عومەر محەممەدخالید رەحما ن مەولوودی .**

بۆکان: **حوسێن شێخبان ـ م .ف کرێکار ـ جەعفەر حەسەن زادە ـ عەلی مەحموودی ـ مەحموود مەعرووفی.**

خانێ: **رئوف عومەری ـ واحید مستەفاپوور ـ جەلال رەحمانی ـ کەماڵ یوسفی ـ عەلی مستەفاپوور ـ ئەمیر خالیدی ـ محەممەد ئەمیـــن زادە ئەسعەد مامەندی ـ عوسما ن مستەفا پوور ـ خدر گولاّنی .**

سـەقز: **محەممەد نافیع عەلایی سەلاح حوسێن زادە ـ مستـــەفـــا غەفاری ـ ئاوارە ـ ع . ئـــاوات جەمالّ رەعدی ـ نـاسر خادمـی محەممەدفاروق فەرەج زادە ـ حامید**

پاوە: **حەکیم سالح .**

سەردەشت : **حاجی حوسیـــن دوخت ـ عەبدوللاّ ئەحمەد بریـو عوسما ن عەلیزادە ـ خدر بێگەلاسی**

شنۆ : **جەلال مەحمـــوودی ، ئەیووب حەیدەری ـ محەممەد عەرەب زێنەب پردئابادی ـ نیعمەت سەروەری مستەفا رەسوولی ئازەر ـ محەممەد هیوا ئاسۆ ـ تاهیر تەنیا .**

مەریوان: **محەممەدسالّح رەحمانی حوسین مەلایی ـ مەحمورد شاداب ئاوارە .**

بانە : **بەختیار میعماری نەبەرد عێراقی ـ جەمیل سەلیمی**

تاران: **حوسێن عەلی زادە ئەحمەد عەلی زادە .**

کرماشان: **سروە شەریفی**

ئیلام: **بەهمەن رەزایی**

ئەهواز: **خدر خەلیناتی**

تیکاب: **حوسین فەهیمی**

ئەندیمشک: **جەعفەر قادری**

**نەغەدە ـ گوندی حەلبی:** کاک مارف نەبی .

نامەکەت گەیشت سپاست دەکەین.

هۆی ئەوە کە شیعرەکانمان چاپ نەکرد ئەوە بوو کە نەمانزانی بەناوی خۆت یان دەبێ چاپ کەین یا هی شاعیرەکەی چونکە ئەم شیعرانە هی خۆت نەبوون.

تکایە لەناردنی پەندی پێشینیان کۆتایی مەکە.

سەرکەوتووبی .

**پیرانشار:** مەلا رەسووڵ عەباسی

برای خۆشەویست قورئان و پێغەمبەر هەردووکیان گەورە و مەزنن وجێگای رێزن. قورئان وتەی خوایە وئەمانەتی ئەوە و محەممەد (ص) رەسووڵ وهەڵبژاردەی خوایە.ئەوە دیارە کە قورئان لەباری گشتی یەوە مەزنترە. لە بارەی نازڵ بوونی قورئان پێویستە بزانی کە قورئان بە دوو چەشن بۆپێغەمبەر ناردراوە یەکیان بەتێکرایی کە لە شەوی قەدردا نازڵ بووە وخوا لە سورەی قەدر ئایەی ۱ دەفەرمووێ انا انزلناه فی لیلة القدر.

دووەم بەش بەش ولەماوەی ۲۳ساڵدا بۆ پێغەمبەر (د.خ) نازڵ بووە .

**مەریوان:** کاک رێبەر. ق .

پاش سڵاو، پێمان خۆشە باسی "حەمەرەشیدخان" مان بۆ بنێری.

رەخنەی خۆت لەسەر وتاری جوغرافیای بانە بەوردی بنووسە بە نووسەرەکەی رادەگەیەنین و ئەگەر پێویست بوو لە سروەش دا دەیگونجێنین.

**مەریوان:** خوشکە گوڵاڵە مازوچی

هاورێ لەگەڵ سپاس .

بەچاوان بەوەختی خۆی باسی پیرە مێردوقانیع دەکەین.ئێمە لایەنگری مافی ئافرەتین ولە زۆر چیرۆک وداستان وباسی وەک ژن بەژنەدا، زۆرلێکراوی وژێرچەپۆکەیی ئافرەتمان خستۆتە بەرچاوی خوێنەران. ئافرەتانیش پێویستە بۆ بەرز کردنەوەی پلەوپایەی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی خۆیان زۆرتر تێ بکۆشن.

بەهیوای سەرکەوتن .

**بۆکان :** سەیدمەسعوود حوسێنی

لە نامە جوانەکەتدا باسی ژن بەژنەت کردووە و هێندێ لایەنی ئەو داب وشوێنە نارەوا ـ یەتان روون کردۆتەوە. ئێمە ناڵێین ئەوەی لەسروەدا هاتووە بێ کەموکووری یە تەنیا مەبەستمان "ختنەسەرباسی" مەسەلەکەیە رچاوەڕوانی بیروڕای گشتی خوێنەرانمانین وهیواداریت نووسراوەی باش ورووناکبیرانەمان لەو بارەوە بۆ بنێرن وئێمەش بڵاویان کەینەوە .

**نەغەدە :** کاک عوسمان مەولوودی

برای بەرێز دیوانی عێلبەگی جاف لە لایەن مامۆستا محەممەد سەدیقی بۆرەکەیی یەوە بڵاوبۆتەوە و لە کتێبخانەی ( انتشارات طهوری روبروی دانشگاه تهران ) دەست دەکەوێ. رەنگە لەمەهاباد و شنۆ ونەغەدەش لەکتێبخانەکاندا هەبێت .

**سنە :** کاک هەژار فارووقی

۱ـ برای بەرێز لە ژمارەی ۱۲ را لاپەڕەیەکمان داوە بە فەرهەنگۆک کە لە ئاخری گۆوارەکەدا دەی بینی .

۲ـ پرسیارت کردووەنووسینی ئەدەبی ئیسپانیا و ژاپۆن فایدەی چیە؟ ئێمە دەڵێین فایدەی زۆرە. بۆ رۆشنبیرانی کورد ناسینی ئەدەبی جیهانی زۆر پێویستە ونابێ خۆی لێ لادەن .

۳ـ کورد لە چوار دەولەتی ئێران وعێراق وتورکیاوسوریادا دەژین وژماریان لەنیوان ۱۵؛ تا ۲۰ میلیۆن دایە. کورد لە وڵاتی ئوستراڵیادا ناژین مەگەر چەند ماڵێک پەڕیوە بووبن .

۴ـ وێنەی دیمەنی جوانمان بۆ بنێرە چاپی دەکەین(ئەگەر وێنەکانت جوان بن) .

۵ـ باسی ژن بەژنەمان زۆر کردووە ودیسان لەسەری دەڕۆین.

۶ـ دووهەمین کۆنگرەی، فەرهەنگی کوردی نازانین کەنگێ دەگیرێ .

۷ـ بەداخەوە "بۆکوردستانی" هەژارمان نیە ولەدەرەوەش دەست ناکەوێ .

**مەهاباد:** کاک رەحمان ئولکوو .

لەوەی کە بە رەنجی زۆر و تێکۆشانی بێ وچانو یارمەتی دۆستان فێری کوردی خوێندنەوە بووی خۆشحاڵین.

هیوادارین هەموو لاوەکان وەک تۆ ئازا وبەتاقەت بن وبۆ زیندووکردنەوەی فەرهەنگ وزمانی خۆیان تێکۆشن .

**مەریوان:** کاک سولەیمان شوکری ::

برای بەرێز دیوانی "بۆ کوردستانی" هەژار و "تاریک و روونی" هێمن بەلای ئێمەوە نین ولەوەی کە دەست ناکەون ئاگادارین.

لەمەر ئەشکەوتی رەفتەوغاری

سەهۆلان هیچ نووسراوەیەکی تەواومان بەلاوە نیە تا بلاوی کەینەوە. دەتوانی بۆمانی بنێری

**مەهاباد:** لوقمانی محەممەدزادە

تۆرەی هونەرمەندی وەک کاک محەممەدی ماملێ و... دەگا و باسیان دەکەین.

کەمتاکورتێکیش تاریخی کوردستان لە سروەدا جاروبار خۆ دەنوێنێ.

لەمەر تاریخچەی ژیانی حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان وعەلی( سەلام و دروودی خوایان لێ بێ) هیواداریــن وەختی خۆی مەتلەب بنووسین.

**نەغەدە:** کەریم عەبدی

برای بەڕێز تا ئەوجێگەی بۆمان بلوێ وێنەی رەنگی چاپ دەکەین.

چونکە گۆواری سروە فەرهەنگی ئەدەبی یە ناتوانین وتاری سیاسی تێدا بلاو کەینەوە.

**ورمێ:** کاک رەحمان ئەحمەدی

زۆر جێگەی داخ ودەردە کە براکانت بەشە مالی خۆت بو دیاری ناکەن ودەگەلت ناسازێن. زۆرن ئەو برایانەی بۆ مالی دنیا دەست دەرووی یەکدی دەنێن وبەشی یەکتر دەخۆن وئەو پەندە لەبیر دەبەنەوە کە: "مالی دنیا دەبێتەوە برا نابێتەوە."

ئەگەر بەقسەی ئێمە دەکەی شکایەت بکە وشاهیدان کۆکەوە و کارەکەت بەرە دادگا و لە رێگەی قانوونەوە دەست بەکاربە دیارە لەپێشدا بەزبانی خۆش و برایانە داوای بەشی خۆت دەکەی وئەگەر نەیانداییەی دادگا و قانوون بۆ رۆژی وا دەبێ و دەتوانی بەشی خۆت بستێنی.

**بۆکان:** برایان کاک عومەرێ گەوهەری ورەئووفی عەلیار:

بەلێ مامۆستا هێمن کوڕی، هەیە بەلام وەک باوکی خوالێخۆ— شبووی شاعیر نیە.کتێبی تاریک و روون قاچاغ نیە بەلام چاپی تەواو بووە ودەست ناکەوێ.

عەکس وپەندەکانمان بۆبنێرن تا ئەگەر باش بوون کەلکیان لێ وەرگرین.

**بۆکان:** مستەفا شوکرە

برای بەڕێز "چارەنووس داستانێکی کۆن و فولکلوری یە و کەس نەینووسیوە. بۆیان ناردووین.

دیوانی مەحوی مان بەلاوە، هەیە بەلام تایبەتی کتێبخانە و ئارشیوە ونافرۆشرێ.

**تاران:** ئەحمەدی عەلیزادە

شیعرێکی کاک حەسەنی سەلاح ( سۆران)ت بۆ ناردبووین کە بە چەند هۆ بلاومان نەکردەوە. یەکەم لەباری وەزنەوە شیعرەکان لەنگن.

دووەم: نازانین کاک "سۆران" رازی یە یا نیە. ئەگەر رەزای شاعیری لەسەرە تکایە شیعری جوانترمان بۆ بنێرە تا بلاوی کەینەوە.

**سەردەشت:** کاک قادر شێخی

ناوی شاعیری ئەم شیعرانەت نەنووسیوە چون شیعری خۆت نین و زۆر مەشهوورن. تکایە ئەوجار کە شیعرت بۆ ناردین ناوی شاعیرەکەشی بنووسە.

سەرکەوتووبی.

**نامە ودیاری ئەم ئازیزانەشمان پێگەیشتووە. پڕ بەدل سپاسیان دەکەین.**

سنە: **تۆفیق مەحموودی ئەبووبەکر عیشقی ـ ئیسماعیل .گ.**

مەهاباد: **چیمەن .ک ـ فەرهاد جەهان میهەن ـ خەلیل نیروومەند ع.ج. شیوا ـ سەلاح گولەندامی موحەممەد هونەرمەند ـ شنەدیهقانی**

نەغەدە: **حەسەن خدر زادە، عومەر عەبدی ـ مرادزایر ـ عوسمان مەولوودی ـ عومەر محەممەدخالید رەحمان مەولوودی.**

بۆکان: **حوسێن شێخیان ـ م.ف کرێکار ـ جەعفەر حەسەن زادە ـ عەلی مەحموودی ـ مەحموود مەعرووفی.**

خانێ: **رئوف عومەری ـ واحید مستەفاپوور ـ جەلال رەحمانی ـ کەمال یوسفی ـ عەلی مستەفاپوور ـ ئەمیر خالیدی ـ محەممەد ئەمین زادە ئەسعەد مامەندی ـ عوسمان مستەفا پوور ـ خدر گولانی.**

سەقز: **محەممەد نافیع عەلایی سەلاح حوسێن زادە ـ مستەفا غەفاری ـ ئاوارە ـ ع. ئاوات جەمال رەعدی ـ ناسر خادمی محەممەدفاروق فەرەج زادە ـ حامید**

پاوە: **حەکیم سالح.**

سەردەشت: **حاجی حوسین دوخت ـ عەبدوللا ئەحمەد بریو عوسمان عەلیزادە ـ خدر بێگەلاسی**

شنۆ: **جەلال مەحموودی، ئەیووب حەیدەری ـ محەممەد عەرەب زێنەب پردئابادی ـ نیعمەت سەروری مستەفا رەسوولی ئازەر ـ محەممەد هیوا ئاسۆ ـ تاهیر تەنیا.**

مەریوان: **محەممەدسالح رەحمانی حوسین مەلایی ـ مەحموود شاداب ئاوارە.**

بانە: **بەختیار میعماری نەبەرد عێراقی ـ جەمیل سەلیمی**

تاران: **حوسێن عەلی زادە ئەحمەد عەلی زادە.**

کرماشان: **سروە شەریفی**

ئیلام: **بەهمەن رەزایی**

ئەهواز: **خدر خەلیناتی**

تیکاب: **حوسین فەهیمی**

ئەندیمشک: **جەعفەر قادری**

**نەغەدە ـ گوندی حەلبێ:** کاک مارف نەبی .

نامەکەت گەیشت سپاست دەکەین.

هۆی ئەوە کە شیعرەکانمان چاپ نەکرد ئەوە بوو کە نەمانزانی بەناوی خۆت یان دەبێ چاپ کەین یا هی شاعیرەکەی چونکە ئەم شیعرانە هی خۆت نەبوون.

تکایە لەناردنی پەندی پێشینیان کۆتایی مەکە.

سەرکەوتووبی .

**پیرانشار:** مەلا رەسووڵ عەباسی

برای خۆشەویست قورئان و پێغەمبەر هەردووکیان گەورە و مەزنن وجێگای رێزن. قورئان وتەی خوایە وئەمانەتی ئەوە و محەممەد (ص) رەسووڵ وهەڵبژاردە ی خوایە .ئەوە دیارە کە قورئان لەباری گشتی یەوە مەزنترە. لە بارەی نازڵ بوونی قورئان پێویستە بزانی کە قورئان بە دوو چەشن بۆپێغەمبەر ناردراوە یەکیان بەتێکرایی کە لە شەوی قەدردا نازڵ بووە وخوا لە سورەی قەدر ئایەی ١ دەفەرمووێ انا انزلناه فی لیلة القدر.

دووەم بەش بەش ولەماوەی ٢٣ ساڵدا بۆ پێغەمبەر (د.خ) نازڵ بووە .

**مەریوان:** کاک رێبەر. ق .

پاش سڵاو، پێمان خۆشە باسی "حەمەرەشیدخان" مان بۆ بنێری.

رەخنەی خۆت لەسەر وتاری جوغرافیای بانە بەوردی بنووسە بە نووسەرەکەی رادەگەیەنین و ئەگەر پێویست بوو لە سروەش دا دەیگونجێنین.

**مەریوان:** خوشکە گوڵاڵە مازوچی

هاورێ لەگەڵ سپاس .

بەچاوان بەوەختی خۆی باسی پیرە مێردوقانیع دەکەین. ئێمە لایەنگری مافی ئافرەتین ولە زۆر چیرۆک وداستان وباسی وەک ژن بەژنەدا، زۆرلێکراوی وژێرچەپۆکەیی ئافرەتمان خستۆتە بەرچاوی خوێنەران. ئافرەتانیش پێویستە بۆ بەرز کردنەوەی پلەوپایەی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی خۆیان زۆرتر تێ بکۆشن.

بەهیوای سەرکەوتن .

**بۆکان:** سەیدمەسعوود حوسێنی

لە نامە جوانەکەتدا باسی ژن بەژنەت کردووە و هێندێ لایەنی ئەو داب وشوێنە نارەوا ـ یەتان روون کردۆتەوە. ئێمە ناڵێین ئەوەی لەسروەدا هاتووە بێ کەموکووری یە تەنیا مەبەستمان "خستنەسەرباسی" مەسەلەکەیە وچاوەڕوانی بیروڕای گشتی خوێنەرانمانین وهیواداریین نووسراوەی باش ورووناکبیرانەمان لەو بارەوە بۆ بنێرن وئێمەش بڵاویان کەینەوە .

**نەغەدە:** کاک عوسمان مەولوودی

برای بەرێز دیوانی عێلبەگی جاف لە لایەن مامۆستا محەممەد سەدیقی بۆرەکەیی یەوە بڵاوبۆتەوە و لە کتێبخانەی ( انتشارات طهوری روبروی دانشگاه تهران ) دەست دەکەوێ. رەنگە لەمەهاباد و شنۆ ونەغەدەش لەکتێبخانەکا ـ ندا هەبێت .

**سنە:** کاک هەژار فارووقی

١ـ برای بەرێز لە ژمارەی ١٢ دا لاپەرەیەکمان داوە بە فەرهەنگۆک کە لە ئاخری گۆوارەکەدا دەی بینی .

٢ـ پرسیارت کردووەنووسینی ئەدەبی ئیسپانیا و ژاپۆن فایدەی چیە؟ ئێمە دەڵێین فایدەی زۆرە. بۆ رۆشنبیرانی کورد ناسینی ئەدەبی جیهانی زۆر پێویستە ونابێ خۆی لێ لادەن .

٣ـ کورد لە چوار دەولەتی ئێران وعێراق وتورکیاوسوریادا دەژین وژماریان لەنیوان ١٥ تا ٢٠ میلیۆن دایە. کورد لە وڵاتی ئوستراڵیادا ناژین مەگەر چەند ماڵێک پەڕیوە بووبن .

٤ـ وێنەی دیمەنی جوانمان بۆ بنێرە چاپی دەکەین(ئەگەر وێنەکانت جوان بن) .

٥ـ باسی ژن بەژنەمان زۆر کردووە ودیسان لەسەری دەڕۆین.

٦ـ دووهەمین کۆنگرەی، فەرهەنگی کوردی نازانین کەنگێ دەگیرێ .

٧ـ بەداخەوە "بۆکوردستانی" هەژارمان نیە ولەدەرەوەش دەست ناکەوێ .

**مەهاباد:** کاک رەحمان ئولگوو .

لەوەی کە بە رەنجی زۆر و تێکۆشانی بێ وچانو یارمەتی دۆستان فێری کوردی خوێندنەوە بووی خۆشحاڵین.

هیوادارین هەموو لاوەکان وەک تۆ ئازا وبەتاقەتبن وبۆ زیندووکردنەوەی فەرهەنگ وزمانی خۆیان تێکۆشن .

**مەریوان:** کاک سولەیمان شوکری ::

برای بەرێز دیوانی "بۆ کوردستانی" هەژار و "تاریک و روونی" هێمن بەلای ئێمەوە نین ولەوەی کە دەستناکەون ئاگادارین.

لەمەر ئەشکەوتی رەفتەوغاری

ئاهەنگی مەولوودی‌یەگیرا .

بەم شێوە تایەرتۆفیق ژیانی رادەبوارد ولەبەرەوە دەشی خوێند. ساڵی ١٣٢٣، کە سەروبەندی شەری دووەمی جیهانی بوو وقاتی وقڕی وکوشت وبڕی وەولات خست و تایەر کە پۆلی سێهەمی ناوەندی دەخوێند ناچار دەستی لەخوێندن هەڵگرت . لەگەڵ ئەوەشدا کە خزم و کەسی دەولەمەند و تێر و تەسەلی بوو باوکی و بنەماڵەکەی زۆر شەو بە برسیەتی سەریان دەناوە ، بەڵام باوکی زۆر ورە بەرز بوو ودەستی یارمەتی بۆ لای خزمە سامان*دارەکانی رانەدەکێشا .

ساڵی ١٣٢٤ چووە بەغدا بەهۆی "سەمەد حاجی محەممەد" چووە ئێزگەی کوردی و تا ساڵی ١٣٣٥ بەردەوام دەستی لە تۆمارکردنی ئاهەنگی رەسەنی کوردی و فۆلکلۆڕ هەڵنەگرت .

ساڵی ١٣٣٦ گەڕاوە، هەولێر ودامەزرا و کرابە کاتبی ناحیەی سیدەکان . ساڵێک لەوێ ماوە وپاشان گوێزراوە بەغدا و لە وەزارەتی نێوخۆ خەریکی کار بوو.

ساڵی ١٣٤١ داوای راگو-ێزتنی بۆ هەولێر کرد . داواکەی بەجێ هات و لە بەشی رۆشنبیری لاوان دامەزرا

ئەم هونەرمەندە لە٢٨ی رەزبەری ساڵی ١٣٦٦ رۆژی سی شەممۆ داری فانی بەجێ هێشت . رووحی شاد بێ و خوا لێی خۆش بێ .

تایەرتۆفیق لە ماوەی ژیانی هونەری خۆیدا ٢٥٧ گۆرانی ومەقامی کوردی تۆمار کراوی هەیە .

زوربەی ئاوازی گۆرانی تایەرتۆفیق فۆلکلۆرین و شیعرەکانیشی شیعری بەرزی شاعیرانی وەک نالی ومستەفا بەگی کوردی وحاجی قادری کۆیی وشوکری فەزلی وسافی هیرانی وعەونی وگۆران و دلدار و هێمن وهەژارە.

تایەرتۆفیق کتێبێکی بەناوی "گوڵی سەربەستی" هەیە کە لەچاپدراوە و زوربەی شیعر و ئاهەنگی فولکلۆری کوردی ئەویان تێدایە .

کتێبەکەی پێشکەش کردووە

- بەو کەسانەی هونەری کوردی یان لەلا بۆتە خوراکێکی گیان و بەشێکی جودا نەکراوە لە ژیانی رۆژانەی خۆیاندا.

- بەگیانی پاکی ئەو هونەرمەندە کوردانەی بە دڵسۆزی کاروانی هونەری گۆرانی کوردی یان بەرەو پێش برد وبەبێ نازی ، سەریان نایەوە و........

لێرەدا سەرەخۆشی لە بنەماڵە وکەس وکاری ئەم هونەرمەندە بەرێزە و هەموو لایەنگرانی فەرهەنگ و فۆلکلۆڕ و هونەری کوردی دەکەین و لەخوای بەرز و بێ هاوتا داواکارین ئەم هونەروەرەی ژیانی هونەری خۆی لەپێناو هونەری کوردی دا بەخت کرد خۆش بێ وبە بەهەشتی بەرینی شاد بکا . "ئامین"

" دەستەی نووسەرانی ".

" سروە "

# ئانتوان چخۆف

سەرپاسەوان "ئۆچەمەلۆف" سەرکێشکی گەڕەک، بە جل و بەرگی پاسەوانی یەوە شنێلێکی تازە لەسەر شان و بەستەیەک بە دەستەوە بەمەیدانی بارفرۆشـ'ن دا رادەبرد. پاسەوانێکی بە قیزیش بەزەمبیلێک توودرکی رزیوەوە، کەلە دەستفرۆشێک زەوت کرابوو، بە دواى دا دەڕۆیی.

بێدەنگی یەکی بە سام مەیدانی داگرتبوو، کەس بەدەرەوە نەبوو. دەرگای دووکان وقاوەخانە و... زۆر بەبێ وازی، هەروەکە زاری دەعبای دڕندەی برسی رووبە دەرەوە داپچڕابوون تەنانەت سوالکەرێکیش بەلاشپیانانەوە دیار نەبوو. لەپڕ هاوارێک پەردەی بێ دەنگی دادڕی ولە گوێی "ئۆچەمەلـوف" دا زرینگاوە:

بەرەڵڵای گڵاو پڕم‌دەدەیەی!

کورینە مەیەڵن هەڵێ. پڕدان لەو دەوروزەمانەدا قەدەغە کراوە. بیگرن! بیگرن! ئای ئای لەو سەگباب خێوەی!"

قرووسکەیەکی دڵتەزین بەرز بۆوە. ئۆچەمەلۆف ئاوڕی داوە. سەگێک لەعەمباری ئاوردووفرۆشی "پێچوکسن" دەرپەڕی. وا وێدەچوو ترسی رێ نیشتووە، هەر هەڵدەهات و ئاوڕی دەداوە! پیاوێکی کراس سپی کە دووگمەی جلیتقەکەی ترازابوون بە دوایەوە بوو! کابرا سینگی دابووە پێش، بە پەرتاو رەپێی دەنا. لە نەکاو خۆی هاویشتێ و دەستی گەیاندە پاشووی، توند گرتی سەگەکە دیسان قرووسکاندی یەکێک هەرای کرد:

" توندی بگرە! بەری نەدەی!"

ئەو هەراوبگرە دووکاندارە خەوالوو وبێ وازەکانی یەک یەک و دوو دوو هێنا دەر هێندەی پێ نەچوو جەماوەرێکی زۆر کەهەر دەتکوت لەعەرز هەڵقولیون لەبەر دەرکی عەمباری ئاوردووفرۆشی کۆ بوونەوە. پاسەوان بە پەلە رووی کردە ئۆچەمەلۆف " سەرکار وەکیل باشی دەڵێی شتێک قەوماوە! خەریکە بشڵەژێ!"

ئۆچەمەلۆف بۆلای جەماعەتەکە لێ هالاوە. تەماشای کرد کابرایەکی جلیتقەلەبەر

دەستی ڕاستی هەڵێناوە و
ئەنگوستی خوێناوی پێشانی
خەڵک دەدا! لەسەروپۆتراکی
واوێدەچوو پێی دا کردبێ
بەرقەوە دەی ڕوانییە سەگەکە
هەر دەتکوت دەیەوێ بڵێ
" گلاوی پیس ڕاوەستە بزانە
چت بەسەر دێنم."بە دەست و
لاقی خوێناوی و شێوەی
ڕاوەستانی زۆرتر وەئاڵای
ئەو شەڕکەرانە دەچوو کە
بەر لەشەڕ دەست پێ کردن
هەڵیدەدەن.ئۆچەمەلۆف هەر
کە لێی خورد بۆوە،زانی
زێڕینگەری بەناوبانگ
"خریۆکین"ە. تاوانباری
ڕاستەقینەی ئەو ئاژاوەیە!

تولەیەکی سپی لەمبۆز
باریکی پشت زەرد لەنێو
جەماوەرەکە بێ دەنگ
وەرکەوتبوو.بەستەزمانە خۆی
مەڵاس دابوو و دەلەرزی
ترس وپەژارە لە چاوەپڕ
ئاوەکانی دا بەدی دەکرا.
ئۆچەمەلۆف خەڵکی دڕدا. بە
دەنگێکی بەرزەوە پرسی:

" چ خەبەرە!؟ بۆ وا
لێرە کۆ بوونەوە!؟ ئەو
قامکە خوێناوی یەت بۆ
هەڵێناوە!؟ چ باسە؟"خریۆ
کین چاوێکی لێکرد،لەمستی
خۆی کۆخی وگوتی :

" قوربان ئەمن بێ ئەوەی
خۆم لەخەڵکی هەڵقوتاندبێ
یان یەکێکم ئازار دابێ
بێرەدا ڕادەبردم. بەهیوا
بووم لەبارەی ئاوردوو لە
گەڵ "میتری میت ئاویچ"
بدوێم. لەپڕ ئەو سەگە
بەدفەڕ وناجسنە شالاوی بۆ
هێنام وپڕی دا دەستم!بمبوورە
بەم قسانە سەرت دێشێنم
بەڵام پێویستە عەرزت بکەم
ئەمن سەنعاتکارم وسەرم بە
کاری خۆمەوەیە. هەرچەند
کارەکەم زۆر گرینگ و
بەرچاو نیە،بەڵام هەرچی
بێ کارە.دەبێ خەسارەتی
ئەو برینەم بدەنێ.بەڵکوو
نەمتوانی هەتاحەوتوویەکی
کاری پێ بکەم. بۆخۆت لە
قانوون شارەزای.لەوێش دا
نەهاتووە،تولەیەکی بەدفەڕ
بتوانێ زیان بە پیاوێکی
بگەیەنێ ولەکاری بکا.
ئەگەر قەرار بێ هەرچی
هەستا پیاوی بگرێ،واچاکە
بەزیندوویی سەری لە سەر
دنیایە نەمێنم"

ئۆچەمەلۆف بە فیزەوە
کۆخی، چەندجاران بڕۆی هێنا
وبرد.بەدەنگێکی نێرانە
کوتی :

" هەمم،ئەوها،زۆر باشە
ئەو سەگە ئی کێیە؟ نەخێر
ناتوانم چاوپۆشی لەوکارە
بکەم. ئەو جۆرەکارانە بێ
قانوونین. ئەو کەسانەی
سەگی نەعاملاو لەشەقامان دا
بەرەڵڵا دەکەن ودەبنە هۆی
ناڕەحەتی خەڵک. پێیان
حاڵی دەکەم ئەو کارەیان
یانی چی. ئیدی وەختی
ئەوەی هاتووە ئەو جۆرە
ئینسانانە تێ بگەن دژی
قانوون جووڵانەوە چ ئاکامێکی
بەدواوەیە.

کاتێک خاوەنە سڕو
سواڵکەرەکەی ئەو تولەپیس
و ڕێوەڵەیە جەریمە کرا
ئەوددەم لەمانای سەگی
بێ تەربیەت بەرەڵڵا کردن
وخەڵک ئەزیەت کردن دەگەن
ڕاوەستن بزانن تالاوی بە
زاری یەوە دەکەم یان نا"

ڕووی کردە پاسەوانی
زەمبیل بەدەست وگوتی :

"بلدیرین بپرسە بزانە
ئەو سەگە ئی کێیە؟!
گوزارشتێکیش بنووسە. ئەو
سەگە دەبێ لەناو بچێ،
دەبێ تا زووە بتۆپێ،بێ و
نەبێ هارە."

ئەوجار ڕووی کردە خەڵک
و گوتی :

" ئەو سەگە ئی کێیە؟"
یەکێک لەنێو جەماوەرەکە
گوتی :

" پێموایە سەگی سەرتیپ
"ژیگالۆف"ە

ئۆچەمەلۆف : " چی!!؟سەگی
سەرتیپ ژیگالۆفە!؟ ئەوها!!
بلدیرین ئەو شنێلەم لە
شانی کەوە، ئەوڕۆ چەند
گەرمە! واوێدەچێ گەرمای
پێش باران بێ." ڕووی کردە
خریۆکین :

" پێم سەیرە!ئەو سەگە
چۆن توانیوەتی ئەتۆ
بگری!؟ زاری چۆن گەیوەتە
قامکت!؟ پێموانیەبیگاتێ!

سەگی واچووکە و پیاوی وا
کەڵەگەت! نەخێر شتی وا
نابێ .بێ وەنەبێ بزمارت
لەقامکی خۆت داوە و بە
ئانقەست بەئەستۆی ئەو
سەگەی دادێنی هەتا شتێکت
وەگیر کەوێ .ئێوە حوققەبازن
چاکتان دەناسم، شەیتان."

یەکێک وەجواب هات:
" سەرکار،خریۆکین بۆ
گاڵتە وپێکەنین ئاگری
جگەرەی بە لمبۆزی ئەو
بەستەزمانەوە نا! ئەویش
زیرەکی کرد و پڕی دا
دەستی. ئەتۆ نازانی ئەوە
چەندە بەدفەڕە!"

خریۆکین بە تووڕەیەوە
رووی لە کابرا کرد:
"هەتیوە شەلە عەیبێ
ناکەی! خۆ بە چاوی خۆت
نەتدیوە،بۆ درۆیان دەکەی!؟
سەرکار پیاوێکی ئاقڵە، بۆ
خۆی دەزانێ کێ درۆزنە و
کێ لە رووی ویژدان و
ئیمانەوە دەدوێ. ئەگەر
پێتان وایە درۆزنم! واچاکە
دادستان بڕیاری لەسەر بدا
لەکتێبی قانوونی ئەودا
هەموو شتێک لەبەر چاو
گیراوە. ئێستا ئیتر کەس
لەکەس زیاتر نیە. تازەکە
وای لێهات ئەوەندەش بزانن
برای منیش پاسەوانە.

ئۆچەمەلۆف نەڕاندی: " چی
دیکەی لەسەر مەڕۆ، بۆ تۆ
نەهاتووە باسی قانوون
بکەی."

پاسەوان کەهەتا ئێستا
بێ دەنگ ڕاوەستابوو ئاقڵ
مەندانە سەری بادا وکوتی:
" سەرکار پێموا نیە
ئەوسەگە ئی جەنابی سەرتیپ
بێ. جەنابی سەرتیپ سەگی
وا راناگرێ. سەگەکانی
وی زوربەیان ئی راوێن."

ئۆچەمەلۆف:
" لێت مەعلوومە ؟"
- بەڵێ سەرکار لێم
روون وئاشکرایە"

ئۆچەمەلۆف :
" بۆخۆشم دەزانم سەگەکانی
جەنابی سەرتیپ هەموو
رەسەن وگران قیمەتن .کەچی
ئەو توڵەیە چی وا نایەنێ!
بەرەڵڵایە! نە تیسکنە نە
دیمەنێکی بەرچاوی هەیە!
زۆر نابوتەیە! بۆئەوە نابێ
رایگرێ. کێ سەگی واپیس
بەخێو دەکا .لەو قسانەی
ئێوە سەرم سوڕماوە! هیچ
دەزانن ئەگەر لەشەقامەکانی
"پترزبۆرگ" یا "مۆسکۆ"دا
سەگێکی ئاوا دیترابا چ
دەبوو؟ کەس گوێی نەدەدا
کتێبی قانوون،حەوت رووحی
پێبا یەکیان پێ نەدەهێشت
کاکی خۆم ئەو چوارپێیە
سەدەمەی پێ گەیاندووە.
هەروا سووک وهاسان لەکۆڵی
مەبەوە. خاوەنەکەی بەتەمبێ
کردن بدە. ئیتر وەختی
ئەوە هاتووە خەڵک تێ بگەن
کە دەبێ رێز وحورمەت بۆ
قانوون دابنێن."

پاسەوان:" وێش دەچێ
سەگی جەنابی سەرتیپ بێ،
کێ چوزانی!؟ خۆ لەنێوچاوانی
نەنووسراوە. پێموایە لە
حەوشەی جەنابی سەرتیپدا
وەبەر چاوم هاتووە"

یەکێک لەنێو خەڵکەکەوە
بە پشتیوانی قسەی
پاسەوانەوە هات:
" ئەوە سەگی جەنابی
سەرتیپە"

ئۆچەمەلۆف:"هەممم...ئەوها..
بڵدیرین ئەوشنێلەم بە
شانی دا بدە. نازانم بۆ
گیانم دەلەرزێ! پێموایە
سەرمام بووە. ئەو سەگە
بەرە خزمەت جەنابی
سەرتیپ ولەخۆی بپرسە .عەرزی
بکە سەرپاسەوان ئۆچەمەلۆف
لە شەقامدا دیوێتەوە و
ناردویەتە خزمەتت. هەروەها
عەرزی بکە دەستوور بدا
پتر ئاگاداری لێ بکەن.
نەیەڵن لەماڵ وەدەرکەوێ
وێدەچێ گران قیمەت بێ،
ئەگەر قەرار بێ هەر کەر
وگایەک هەستێ و ئاگری
جگەرەی بە لمبۆزی یەوە
بنێ! رەسەنایەتی خۆی
لەدەست دەدا. سەگگیاندا ـ
رێکی ناسک وزەریفە."

ئەوجار رووی کردە خریۆکین
" کەرە شێتە ئەوە بۆ
هەروا راوەستاوی!؟ دەستت
بەردەوە بزانم. پێویست
ناکا قامکی بەبڕین چووت
پێشانی عالەم بدەی.

خەتاباری."
پاسەوان لە نەکاو بەخۆشحاڵی یەوە رووی کردە ئۆچەمەلۆف :
"سەرکار هۆوە ئاشپەزی جەنابی سەرتیپە، بەرەو ئێرە دێ. با لێی بپرسین :
" هۆی کاکی زۆرخۆر، وەرە بزانە ئەو سەگە ی ئێوەیە؟
ئاشپەز:
" ئەوە دەڵێی چی! ئێمە سەگی وا راناگرین."
ئۆچەمەلۆف :
"هیچ پێویستی بەپرسین نیە، ئەو تولەیە بەرەڵڵایە لەخۆڕا قسەی لێ دەکەن ! کاتێک ئەمن دەڵێم بەرەڵڵایە یانی بەرەڵڵایە .دەبێ بتۆپێ ئیدی قسە لێ کردنی پێ ناوێ
ئاشپەز درێژەی بە قسەکانی دا:
" ئەوسەگە ئی برای سەرتیپە، دوێنێ تەشریفی هێناوە .ئاغام ئەوجۆرە سەگە خوێریانەی بەدڵ نین . براکەی ئی وا رادەگرێ."
ئۆچەمەلۆف لە نەکاو بزەیەکی شیرنی لەسەرلێو نیشت وگەشاوە :
"ئەوها ...ولادیمیرئیوا ـ نویچ" برای بەرێزی سەرتیپ تەشریفی هێناوە!؟ بەڕاستی ئەو خەبەرەم پێ خۆش بوو نەمزانی بوو بە میوانی تەشریفی هێناوە؟"
ئاشپەز:
"بەڵێ"
ئۆچەمەلۆف :
"مێوان .... بێ ونەبێ دڵی بۆ براکەی تەنگ بووە... سەیرە ! ئەمن نەمدەزانی ئەو سەگە جوانە ئی برای سەرتیپە! زۆر خۆشحاڵم . کەوابوو لە باوەشی کە و بیبەوە. سەگی چاکە زۆریش شەیتان و بزۆزە ! پڕی داوەتە دەستی ئەو پیاوە هاهاها!... تولەگیان دەلەرزی !؟"
تولە کەچاوی بە یەکی ناسیاو کەوتبوو وەکلکە سووتە کەوت ودەستی بە وەڕین کرد...ووو...ووو....
ئۆچەمەلۆف :
"بەستەزمانەتووڕەبووە!"
رووی کردە خریۆکین :
"بێ ئاقڵی خەرفاوی چینی ئەوە چیت بەسەر ئەو بەستەزمانە هێناوە!؟"
ئاشپەز سەگەکەی وەدوای خۆی دا ورۆیی.
خریۆکین کش ومات راوەستا بوو ! خەڵک سەریان هاویشتبووە سەرو قاقا پێی پێدەکەنین . ئۆچەمەلۆف سەنگین وگران لێی مۆڕ بۆوە. بەهەڕەشە پێی گوت :
"دوایە بە خزمەتت دەگەم."
شنێلەکەی توند لە خۆیەوە پێچا و بە دوای کاری خۆی دا رۆیی

# شاعیرانی لاو

که نات بینم
ژیلەمۆی دڵی سووتاوم
گڕ بەردەداتە هەناوم
وەجۆش دێنێ
کانی خوێن دەڵێنی چاوم
کە دەت‌بینم، تیشکی نیگات
بۆ منی تامەزرۆی ئەوین
دێتە ژوان،
ئەم نیگایە پڕمانایە
بۆ دوانی من
دێتە زمان
تەزووی ساردی هەناسەکەم
هەستی کڵۆڵ دەبزوێنی
یادی ناسۆری تەشەنام
تینم لە ژین دەتارێنی
دەگەڵ تۆ چبکەم ئازیزم
یا بە گەرما دەمسووتێنی
یا لە سەرمان دەمتەزێنی
یا لە تەنیا بۆ جارێک
بەڵام هەر
دان بە عیشقم داناهێنی

مارف ئاغایی

ئیمشەو دەستم
خستە سەرشانی بێدەنگی
هێدی ... هێدی ....
بە هەورازی هەڵەمووتی زامەکانا
لەگەڵ پێچی ژانەکانا
سەردە کەوتم
بەرەو دوندی خۆشەویستی
لەپاش پەڵە هەورەکانا
ئەستێرەکان دەجریوێنن
گۆرانی عیشقی تامەزرۆ
بە گوێچکەی شار
دەچرپێنن
ئیمشەو لە ناو
کۆڵانی تەنگ وتاری شاری خامۆشم
مەیل وتاسەی گڕگرتووی
شیعرێکی بەجۆش
هەگبەی ژانی پڕ سفت وسۆ
وەک هەواڵێک
دەخەمە بەر
تروسکەی چاوەکانی تۆ

فریشته . ش

...روه کیژه جوانەکەم
کچە نەشمیلانەکەم
گوڵاڵەی باخی ژینەکەم
شەمامەی بێستانەکەم *
بووکی لەکشەوەی تازەم
ئاهەنگی پڕ ئاوازەم
بێ یار و هاوردەم مردم *
وەرە ئەی یاری تازەم *

عمر کاکەمەر

من ئەوینم
لە قووڵایی هەستمدا
ئەوینێکی بڵێسەداری
لە سۆمای چاوەکانمدا
تروسکەیی گڕێک دیارە
ئەویش پرچی مەشخەڵێکی
پڕشنگدارە

عیسا ئاهی

## هەمزە پشدەری

تووڕەی بلوێر لە لوتکەی کێو سۆزێکی
بەرگوێ داوم
بەرەوگڕی لوتکە بێمو خەویش بزڕێ لە
دوو چاوم
لەبیرم چوون سەدا ن تابلۆی سەربەتەمی
نێو سروشتم
گیانی نوێیا ن پێ دەدام و تونـد
لێویا ن پێ دەکرۆشتم
بۆیە دێم وەکوو تۆ شوانە ئاسـۆ
دەئامێز بگرم
یا بگەمە گوڵی هیوام یا لەرێگادا
بمرم

---

لە لووتکەی بەرزی ئاواتم،
لە ئاسوگی روژهەلاتم
لە لەبرەو دایە
زەردەی خور بە هیوایە
بویە دلم وەکوو چی وام
باپیت بلیم پر لەهیوام ؟
وەی دلی بەرزی ئاراراتە
وەکوو بەلام کش وماتە
بەرزە پانم وەک ئاگرە
جەرگی ئاوریش ناگری
گەرمە و زیخی رەندولە
لەشم وەک خاک و خولە
لە ریگەتا تنوکی ئاو
لە پیناوتا ئەریژم تەواو
بو سەربەرزیت گیاندەرم
من لە ریگەتا دەوروبەرم
روشنی کەی

---

## مەعسوومە ئەدیب

با بنووسم بە پێنووسی نێو دەستم
بۆچ پێ شێلە بوون و ئاوات و هەستم ؟
ئافرەتم جا چ بوو لە کوردستانم
بۆ لە رێزی دیلان و ژێردەستانم ؟
" ئافرەتبوونمان شایی لێ کردووینە شین
ئافرەتی کورد" بوونە وارۆژەرەشین !
قەڵای ستەمی پیاو ئەوەندە بەرزە!
بە راسان و شۆرش نایەتە لەرزە!
ستەم بەسە مەگەر ئێمە ئینسان نین ؟
ئێمەش هەروەک ئێوە خەڵکی سەرزەوین
راستە دەڵێن ئافرەت نیوەی کۆمەڵە
بەڵام رێزی وەک بزن ومانگا گەلە
تۆخودا بەسە چیدیکەمان مەفرۆشن
چیدی تووک و نزای ئێمە مەخرۆشن

---

بۆ دەنگم بێ دەنگە
مەترسی جەردەیەکی چاوچنۆکە
چەقی رێگەی دنیای دەروون
بە هەناسەی پڕ لە تاسەی
شیعرە ساواکان دەگری
نەزانی جەللادێکی نەزۆکە
بێ بەزەیی
ملی وشە
دەباتە
بێ وزەیی بەر داروبەندی ناهومێدی
لەپێش چاوی هەواڵێکی ترسەنۆکە
گاڵتە بە یارو دیار
و هەر بە بەرهەمان دەکا
گۆنای خۆیان بۆ دەرنێ تەنێ
خالید

# ڕێنوێنی ئەدەبی

شنۆ: ئیبراهیم مورادی
شیعرەکەت لەباری وەزن وقافیەوەلەنگە سووژەکەت زۆر کۆنە وەک :

ئەوەندەم بیرکردەوە سووتام لەخۆڕا
هەتاکەی ئەم سووتانە ئەو سووتانە لەخۆڕا

وشەی "نیە" و"وەکوو"قافیە نین .

دیسان : ڕۆڵە وجووڵە قافیە نین، وشەی ڕۆڵە لە دوو سێ جێگا بۆتە قافیە کە دەبێتە ڕەدیف و وشەی پێش ئەو دەبێتە قافیە.لەباری وەزنیشەوە کەموکووڕی هەیە وەک :

خوێندن دەرمانە بۆ دەردی ئێمە
بێ خوێندەواری نەجات بوون سەختە ڕۆڵە

نەغەدە: بەدرەدین محەممەدئەمین
شیعرەکەت لەباری وەزنەوە لەنگە. وەزنی نیە.

شەرتە ئیتر بۆن نەکەم گوڵێک بێ گوڵزار
ئەگەر خوێنم لەدڵ نەبێ
ناپەرستم ژیانی بێ یار
وانەکەم وەک رابردوو ڕوو لە زستان پشت لەبەهار
چەکوشێکی پۆلایین بم وەک کاوە بم بۆ زۆردار

شنۆ: جەلال واهیم
لەم دوو شیعرەی:

رەحیم وغەفوورتەنیا بۆخۆتی
چرای هەڵکراو لەبۆ ئۆممەتی
خەلقت کردووە دونیا وقیامەت
تاکوو بناسی گشت بەندەکانت

بۆخوت ،ئۆممەت ،قیامەت بەندەکانت قافیە نین

..... نۆران عیلمئابادی
شیعرەکەت لەباری قافیەوە نارێکە ووشەی عەزیز، دۆست ئەدیب، هەستیار، دەرد، سۆز بێگانە، وئەدەب قافیە نین . بەڵام وەزنی شیعرەکەت وەزنێکی خۆماڵی یە وسووژەکەت جوانە .

مەریوان :خوسرەو خوسرەوی
نووسیوتە :

وەتەن قوربانی خاکی بۆشت بم
قوربان هەڵاڵە وگوڵی گەشت بم
بۆش ودەشت وداخ و زار

نابنە قافیە.لەباری وەزنیشەوە عەیبدارە وەک :

قوربانی ئاوی کەوسەرت بم
بەفیدای خاکی گەوهەرت بم

وەزنەکەی لەگەل شیعرەکانی پێشوو یەک ناگرێتەوە .

بۆکان :محیەدین ئەحمەدی
شیعرەکانت لەباری وەزن و قافیەوە کەمو کووڕی یان هەیە وەک :

زۆر بەداخ بوو بۆمن فەوتی تۆ
ئاخر تۆجێگات خۆش کردبوو لە
ناو دڵی منی ڕەنجەڕۆ

دیسان کوردستان وجیهاندا، چرای گەل، مەشعەلی گەل، خۆش و بەهەشت قافیە نین .

سەقز: جەلال سەلیمی
سووژەیەکی جوانت هەڵبژاردووە بەڵام بۆ شیعر نابێ ودەتوانی لە چوارچێوەی وتاریکی ئاییینی دا بۆمان بنێری. چون ئەم سووژانەی باسی نسحەتی خەڵکن یا دەبێ بەشێوەی شیعرێکی زۆر پوخت و پاراو بێ یا بە نووسینێکی ڕەوان .

خانێ : عەلی ئاغەندە
بۆمان ساخ نەبۆوە ئەوەشیعرە یا نەسر :

ئەوە خالەقی جیهان رووی کردە دنیا
چرای هەڵ کرد بۆمان خاتم الانبیا
ڕۆیشت بەجێی هێشتم بێ مەوتەنی کردم
دەستم بەدامەنی پاکی گرتە بەری
داموبەجێی هێشتم

خانێ : مەعسوومە ئەدیب
ئەم شیعرە لاسایی پیرەهەڵۆی مامۆستا هەژارە کە دەڵێ :

پایزە دارودەوەن ڕەنگ زەردە
با تەزوو سەردە بەتۆزو گەردە
دیارە لای شەختەیە ناخۆش خەوەرێ
دارەخۆی دەرنێ خەزەڵ هەڵدەوەرێ

تۆ نووسیوتە :

دەڵێن پایزە دەوەن ڕەنگ زەردە
بولبول دەگری دەدا بە سەردا
دەشت وکێو جلی زەردی پۆشیوە
دار خۆدەرنێ کوڵ هەڵوەریوە

نەغەدە: ئەبووبەکر خزری
"بنچارە دایک" دەبێتە ڕەدیف. جا وشەی کۆ، باب، بنبەر ،جەرگ ،لەسەر ،بەیانی،خواردن و.... نابنە قافیە.

سنە : حشمەت عەلی خانی

وەزنی شیعرەکانت یەک نیە وەک :

دیسان کوردستان لەنوێ بەهارە
تا سروە بێ جەژنی هەزارە
ئیتر نەما رەشپۆشی گولان
یەمالێ هات و هەلفڕی زەلان

هەمەدان: خالید ئەمینی

ئەوانە شیعر نین. شیعر دەبێ سەرەرای ئەوە کەنێوەرۆکێکی جوانی ببێ وەزن و قافیەشی هەبێ دەنا دەبێتە قسە. تۆ نووسیوتە:

چاکەوخراپە لە لەشی ئینساندایە
غەموشادی کولە قەزاوقەدەر دایە
ئەی گەردوون حەوالەی رێی عەقلی مەکە
گەردوونی تر هەیە لە تۆ زۆر بێچارەترە

نە وەزنی هەیە ونەقافیە. بەیتەکەی ئاخریش مانای حیە.

نەغەدە: حوسین رەش سوورە

شیعرەکانت زۆر لاوازن. نە وەزنیان هەیە ونە قافیە.

دایە بریا پێلاوی ژێرپێت بایەم
ئەسرینی گەشی چاوانت بایەم
باوەشی گەرمت هەوەلێ مالم بوو
بریا لەومالەش ئاخرەت هاوالت بایەم

خانێ: ئیسماعیل حوسێن نژاد

شیعرەکەت وەزنی نیە. دەیەو شەوێ نابنە قافیە .بەرجی ئەوانەش شیعری مندالانە دەبێ کورت و پڕ مانا وهاسان بێ بۆ ئەوە زەینی مندالێ لەبەری بکاو دیسان بتوانێ بیلێتەوە .

نەغەدە: مەعرووف نەبی

مەنزوورم هەیە ئەی سروەی
دەنگ خۆش
تۆبووی دنیات خستە جۆش
کەشیعرم ناردبوو کردت
بەرووپوش
هەتا ئەمن بەلەگەلت ناگرم

دۆستایەتی خۆش

ئەم دوو شیعرەت بۆنموونە چاپ دەکەین. وەزنیان نیە . ئەوانی دیکەش هەروان. دەنا شیعری جوان قەدری لەسەر چاوانە.

شنۆ: یوسف رەحمانی

هەنار وگولستان ، نابنە قافیە. وشەی ئال وچاووخومارـیش قافیە نین. شیعرەکانت وەزنیشیان نیە .

بانە: زامار

مەستی دلم لە چەند جێگا بۆتە قافیە. ئەوجار لەباری قافیەشەوە لەنگی دیکەی هەیە وەک مەستی دلم ،زامی دلم کە نابنە قافیە. بەلام وەزنی تەواوە ولەم بارەوە ئیرادی نیە .هەستی شاعیرانەشی تێدایە .

سەقز: ئەنوەر مەعریفەت

هەستی شاعیرانەت هەیە بەلام شیعرەکانت خاون. هێز و پێزی شیعری باشیان نیە، لەباری وەزنەوە پێویستیت بە هێندێک موتالا هەیە. جیاوازی شیعر و پەخشان لە وەزن دایە .

خانێ: عەبدوللا تەقرارە

لەباری وەزنەوە شیعرەکەت لەنگە وەک :

لەسەرچی بەعسی کافروای لەتۆ
کرد ئەی پیرانشار
بەکام تاوانەوە وابوری بە
کۆی نار
لەخوێن لافاوی نووح خەریکە
هەستی
لەدەریای نەهێلی قەومی کوففار

بۆکان: محەممەد....

ئەگەرچی سووژەیەکی جوانت هەلبژاردووە بەلام نەتتوانیوە باش پێی رابگەی. لەباری فەننی شیعرەوە وەزنیان نیە و وشەی جوان وسەرلق نابنە قافیە.

نەغەدە: بەدرەدین سالح

شیعرەکانت هەستی شاعیرانەیان تێدا بەدی دەکرێ بەلام خاون. لەباری وەزنیشەوە هێندێک کەموکووڕی هەیەوەک ئەم شیعرە:

فرشتە وکۆتر و بولبولان
موژدەی بەهاردێنن بۆگولان

کەڕاوا: ئەسکەندەر ئەمینی

دەزانی لەم چەند شیعرەدا رەدیفی شیعرەکان "گرتووە"یە جا کەوابوو چۆپی وشین دەبێ ببنە قافیە وقافیەش نین. ئەم دوو شیعرەیان جوانە

لۆمەیان مەکەن هەرگیزاوهەرگیز
گەرکە شینیانە لەگەل بای پایز
گولی بەهاری ژینیان مردووە
هێمن لەناکاو کۆچی کردووە

میاندواو: حەسەن حوسین پوور

شیعرەکان زۆر لاوازن. وەزنیان نیە و دوو لەتە شیعری یەک جور نابنە بەیتێک .

خڕیان کەوە کورد زیندووە
نەمردووە
خڕیان کەوە کورد زیندووە
نەمردووە

شیعری ئەم ئازیزانەشمان بەدەست گەیشتووە. سپاسیان دەکەین.بەلام لەبەر ئەوە کە شیعرەکانیان زۆر پوخت وپاراو نیە و یا لەباری وەزن وقافیەوە کەم و کووڕی هەیە ویا لەباری نێوەرۆکەوە لاوازە ناتوانین چاپیان بکەین .

سەقز: رەئووف تەیموور تەبەر
مەهاباد: فریشتە س .
شنۆ: هەمزە ئیلاهی
.....: لوقمان .ن
.....: ن ـ هادی .
شنۆ: ئیبراهیم ئەحمەدیان
شنۆ: زورار پەیغامی
سەقز: ع. پەشێو

**پاشماوەی سەروتار...**

این مرکز وطرح پیشنهادات وانتقادات وارزیابی کارهای انجام‌شده در هر مقطع خود را متعهد ببینید؟ تعیین کنندهٔ موقعیت، شکل وسطح کار خواهد بود. برای فراهم‌آمدن شرائط ایده‌آل، نخست باید درایجاد ارتباط هرچه بیشتر کوشید. این ارتباط باید مستمر، نزدیک و دو طرفه باشد. تاکنون ما با برگزاری مسابقه علمی، فرهنگی، انجام مصاحبه‌های حضوری، برگزاری کنگرهٔ فرهنگی ـ ادبی، ارسال جوابیه‌های برادران وخواهرانی که برایمان نامه نوشته‌اند، نظرخواهی های عمومی و.... سعی کرده‌ایم که این ارتباط را ایجاد نموده وازثمرات آن بهره‌گیری نمائیم و همچنانکه در شماره قبلی عرض شد، این اقدامات به‌نتایج موثری انجامید و درمجموع توانست بعنوان پشتوانه‌ای جدی راه آینده را روشنتر نموده وامید بیشتری برای برنامه‌ریزیهای درازمدت بوجود آورد. اما اگر نخواهیم با مسئولیت بیشتری به‌وظایف خود بیندیشیم بروشنی درمیابیم که هرگز نمیتوانیم این مقدار را ایده‌آل بدانیم. هرچند هم‌اکنون سیل نامه‌هایی که به‌ما میرسد وقت زیادی راهزینه میکند لکن بصراحت باید بگوئیم که نامه‌های پر احساس ولطف علاقمندان برای ما بسیار اهمیت داشته و ما خواهان هرچه بیشتر شدن حجم آن هستیم. چه به گمان ما، این عملی‌ترین صورت ارتباط بوده‌ومقدمه‌ای برای همکاریهای گسترده‌تر درآینده محسوب میشود. اطلاع از اینکه دوستان ابعادِ مختلف ازمطالبِ سروه را چگونه میبینند و برای تبدیل آن به "سروه"ای زیباتر و روحبخشتر چه پیشنهادی دارند؟ برای ما امری ضروری وبدیهی است. تصدیق میفرمائید که‌اختلاف در قشر، تحصیلات و سن هزاران خوانندهٔ "سروه"، درعین آنکه افتخار این مرکز است، دست اندرکاران را بامشکل مهمی در دسته بندی مطالب وارائه آنها مینماید. طبیعتا" در چنین شرایطی آگاهی مستمر از نقطه‌نظرات شما از لوازم این خدمتگزاری است. قبل از ادامه بحث دراین فرصت لازم میدانیم تا به آن دسته از دوستان که تاکنون با نوشتن وارسال پیشنهادات وانتقادات مارا درجریان نظریات‌خود گذاشته واحیانا" تاثیر آنرا ملاحظه نکرده‌اند، مطلبی را یادآور شویم.

این دوستان باید بدانند که اگر درشرایط حاضر نتوانیم بعضی از پیشنهادات منطقی واصولی را عملی کنیم ویا قبول بعضی از انتقادات صحیح را درعمل نشان دهیم، به معنی پشت گوش انداختن آنان نیست بلکه همه این نظریات، جمعبندی شده و برنامه‌ریزی های آتی بر مبنای آنها انجام خواهد گرفت. ما وضعیت موجود، شکل کار وثمرات آنرا بهیچ وجه ایده‌آل نمیدانیم وبکارگیری تمامی امکانات برای دادن رشد کیفی وکمّی به‌همه جوانب‌آنرا ضروری میدانیم. ما ضمن بهره‌گیری از تجارب موجود، مشاورهٔ مستمر با شما را برای خود مهمترین امر تلقی کرده ونظریات شما را بزرگترینِ سرمایه‌ها وامکانات برای رسیدن به شرایط مطلوب میدانیم. درهمین راستا دفتری را دراین مرکز بعنوان دفتر ارتباط با علاقمندان "سروه" باز کرده تا ازاین پس‌نسبت به ایجاد ارتباطات گسترده با دوستان سرمایه‌گذاری بیشتری بعمل آید. این دفتر بعنوان اولین گام فرم ویژهٔ نظرخواهی وسنجش افکاری راکه بر اساس

نیازهای آتی این مرکز و تجارب بدست آمده تنظیم نموده است را برای دوستان علاقمند ارسال خواهد کرد. این فرمها درمرحله اول صرفا "برای علاقمندانی که تاکنون حداقل یکبار برای ما نامه نوشته‌اند (و یا بنویسند) ارسال میشود.

توضیحات لازم در پاسخ به پرسشها ونحوه تکمیل فرم نیز بعنوان ضمیمه تقدیم علاقمندان خواهدگردید ما ضمن آنکه امیدواریم که این بحث تحرک، شوق وانگیزه بیشتری را برای همکاری گسترده ونزدیک با این مرکز درهمه‌خوانندگان محترم ایجاد نماید، از دوستان عزیزی که فرم‌ویژه نظرخواهی را دریافت میکنند استدعا داریم تا ضمن دقت هرچه بیشتر درتکمیل فرم، نسبت به ارسال سریع آنها اقدام فرمایند.

دوستان عزیز! بی شک. شما دوستداران "سروه" میخواهید تا این مجله زیباتر وپرمحتواتر انتشار یابد وبهمین دلیل هم، انتقادات وپیشنهاداتتان را برایمان ارسال میدارید و انتظار دارید تا از نتایج آنها نیز باخبر شوید. دوستان! در این زمینه باید باطلاع شما برسانیم که نظریات وانتقادات، واصله بدقت موردبررسی قرار گرفته و به آنها درحد امکان ترتیب اثر داده میشود. اما توجه به این نکته لازم است و آن اینکه سلیقه‌ها و عُلقه‌های افراد متفاوت است واجرای همه نظرها، هم به دلیل تضادی که‌بعضا" بین نظریات وجود دارد و هم بدلیل مشکلات اجرائی این مرکز و محدودیت ظرفیت "سروه" غیرممکن است. منتها تلاش ما بر اینست که‌حتی الامکان رضایت‌شما راجلب نمائیم.

عزیزان! ما نیز میخواهیم که"سروه" بعنوان مجله‌ای بی عیب ونقص وشامل همه موارد موردنظر وعلاقه شما منتشر شود، اما اینکار نیاز به‌امکانات و زمان دارد. قطعا" یک مجله مثلا" هفتاد صفحه‌ای که‌هر ماه یکبار انتشار میابد قادر نخواهد بود گلچینی ازهمه مسائل اجتماعی، سیاسی،فرهنگی،ادبی،تاریخی اقتصادی،جغرافیایی، هنری ورزشی و..باشد. چه هریک ازاین ابعاد خود دارای بعدهای فرعی زیادی هستند که دریک مجله (حتی هزار صفحه‌ای) نمیگنجد. برهمین اساس پس از مطالعات و بررسیهای بعمل آمده ستونهای ثابت ومتغیری برای آن درنظر گرفته شده تا ضمن حفظ هویت فرهنگی ادبی مجله، به مسائل دیگری که موردنیاز وعلاقه مردم عزیزمان است‌پرداخته‌و رضایت طیف گسترده، خوانندگان محترم را جلب نمائیم. البته این موضوع به بحث بیشتری نیازمند است ولذا تفصیل آنرا به آینده موکول مینمائیم.

"خدا یار ونگهدارتان باد"

هێشتا بەفرلێی نەکردبۆوە
وسەرمای بێ دەرەتانی سەرلە
بەیانی وەلەرزی* خستبووین .
دەرگای قوتابخانە ئاواڵە
بوو و حەوشەکەی بە نوا
بەفرێکی سپی رازابۆوە .
بەهوو هووی دەستان لە
پلیکانان وەسەر کەوتین و
خۆمان گەیاندە دەرکی سالۆن
کەچی بەپێچەوانەی رۆژا ن
داخرابوو وقوتابی یەکا ن
هەریەکە لە سووچێک لەژێر
پەنا وپەسیواندا هەلکورما-
بوون . خودا خودامان بوو
زوو زەنگ لێ بدرێ وبچینە
ژوور. لەنەکاو دەنگی
جەنابی مودیر لە بلێندگۆ
بەرز بۆوە :

_ قوتابی یەخۆشەویستە
_کان سەف بگرن وریز بن .
هەر بابا بوو بۆلەیەکی
لێدەهات ودەیگوت :
_ بۆخوت جێت گەرمە و
ئاگاشت لە ئێمە نیە!

ئەوجار جەنابی مودیر
بۆخوی هاتەدەر وچاوێکی
پێدا "خشاندین وگوتی :

_ ئازیزان لەم هەوا
بەفراوی یە جوانەی
ئیمرۆکەدا تاقی کاری یەکی
زۆر هاسان بەلام زۆرگرینگم
بۆ دیاری کردوون .

دەبوو سەرنج بدەین و
گوێ رابدێرین و لەگەڵ
سەرماش بچارێین* . پیاو
هەزار جۆر خەتەرەی دەکرد
« داخوا بەفر دەرخواردی‌کێ
دەدەن ؟ یا زۆرەوانیمان
پێدەگرن ، نا بابە حەتمەن
سەربانمان پێ دەماڵن .»
لەو خەیاڵانە دابووین کە
جەنابی مودیر لە پلیکانان
داگەڕا و سەفی دابڕاوی
ئێمەی تێکەڵ کردەوە و
هەمووی کردینە ریزێکی
درێژ و راست .
مامۆستاکانیش هەموویان
لەسەر پلیکانەوە چاویان
لە تاقی کاری جەنابی مودیر
بڕیبوو. وەختێک سەفەکەمان
بەکەیفی کاکی مودیر راست
بوو، هێندێکی نێوان بۆ
دیاری کردین وگوتی :

_ قوتابی یە
خۆشەویستەکان! مەرجی
تاقی کاری* یەکە ئەوەیە کە
دەبێ ئێوە هەتا ئەوسەری
حەوشی قوتابخانە بڕۆن و
بەجێ پێی کەوشەکانتان
رچە*یەکی راست بشکێنن .
دووپاتی دەکەمەوە...بزانم
کێ دەتوانێ بەجێ پێی
کەوشەکانی خەتێکی راست
هەتا ئەوسەری حەساری
مەدرەسە بکێشی .

پشوویەکمان هاتەوە بەر و
گوتمان :

_ ئەگەر هەر ئەوە بێ
هیچ نیە تەنانەت یەک لە
قوتابی یان گوتی :

_ هەی ماڵتە دەزووتوت
واگوتبایە دلم سیس بوو!

هەموو وێکڕا سەرمان
داخست و وەنێو بەفر
کەوتین . تەواوی فکر و
هۆشی خۆمان دابووە سەر
هەنگاوەکانمان.هەی خوایە
لاقمان خوار نەبێ، هەی
پێغەمبەر لێمان خوار نەبێ.
هی واش بوو خۆش خۆش
ئاوڕی دەداوە تا بزانێ
رچەکەی راستە یا خوار .
هەر کەسە لەفکری خۆیدا

بوو تا لەو تاقی کاری یە هاسانەدا سەرکەوێ .

چەن دەقیقەیەک پێ نەچوو کە گەیشتینە ئەوسەری حەوشە وەختێک ئاوڕمان دایەوە دیتمان ڕێچکەی هەموومان خوارە . لەنێو تەواوی قوتابی یەکاندا شێرکۆ توانیبووی بە جێ پێی کەوشەکانی خەتێکی ڕاست دیاری بکا .

مودیر شێرکوی بانگ کردە لای خۆی وگوتی :

- بارەکەڵڵا شێرکۆ . ئەتۆ لەدەرس ودەورەکانیشدا هەروا ئازای . جا ئێستا بە هاواڵەکانت بڵێ کە تۆ چۆن لەم تاقی کاری یەدا سەرکەوتی ؟

شێرکۆ لە حاڵێکدا کە بزەی دەهاتێ ڕووی لەئێمە کرد و گوتی :

- هاوڕێیان ! من وەک ئێوە هەر لەفکری چەپ و چیڕ یا ڕاست هاویشتنی هەنگاوەکانمدا نەبووم . بەڵکوو لەوسەری حەساری میلەیەکم کردبووە نیشانە جا چون ئەو هەدەفەم هەر لە نەزەردابوو چاوم هەر لەوی بڕیبوو تا پێی گەیشتم . نە ئاوڕم داوە و نە هێندە چاوم لەبەر پێی خۆم کرد . ئینسان لە ژیانیشدا قەت بێ هەدەف سەرکەوتوو نابێ . ئێمە کە هەدەفمان ، ئامانجمان دەرس خوێندنە و چاوەڕێی داهاتوویەکی ڕوونین نابێ هیچ کەندوکوسپێکی ژیان لەو ڕێگا پیرۆزەمان بگێڕێتەوە ....

ئەوجار کاکی مودیر هاتەپێش . شێرکۆی ماچ کرد . بۆخۆی ڕووی لە ئێمە کرد و گوتی :

- قوتابی یە ئازیزەکان ، مەنزووری من لەو تاقی کاری یە تەنیا سەلماندنی ئەم ڕاستی یە بوو کە ئادەمیزاد لە ژیانیدا بێ بەرنامە و ئامانجێکی دیاری کراو تێ بکۆشی ئاخری سەری لێ دەشێوێ وبە ئاوات ناگا . هیوادارم ئێوە خۆشەویستان بۆ ئەم خوێندن وزەحمەت کێشانەتان هەدەف و ئامانجێکتان هەبێ چون خوێندن هەدەف نیە بەڵکوو کەرەسەی گەیشتن بە هەدەفە ئێستاش دەرگای ساڵۆن ئاواڵەیە هەروا بە سەف بچنە ژوور وخەریکی دەرسەکا - نتان بن !

# بانگەواز

ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی ( ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی) بەنیازی خزمەتی هەراوتر و کاری تر بە فەرهەنگ وئەدەب ومێژووی کورد خەریکی دابین کردنی ئارشیوێکی دەوڵەمەندە تا بتوانێ لە هەموو روانگەیەکەوە پاڵپشتی سەرچاوەی بڕواپێکراو بۆ نووسەران و توێژکارانی ئەم ناوەندە وهەموو وڵات دابین بکا . بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە گرینگە پێداویستیمان بە یارمەتی هەموو بنکە و ناوەندە فەرهەنگی یەکانی وڵات و و دەرەوەی وڵات هەیە .

تکایە لەم بەستێنەدا لە هەر چەشنە یارمەتی یەکی لەدەستی ئێوە دێ درێغی مەکەن . ئەوەی پێداویستە بریتین لە بەڵگە و سەنەد و نووسراوە و وێنە و فیلم و کتێب و گۆڤار و ....لەمەڕ رووداوە مێژوویی یەکانی ئەم سەردەمەی تێیدا دەژین و هەروەها کتێب و نووسراوە-گەلێک کە بتوانێ مێژووی لەمێژینی کورد روون بکاتەوە.

ئەم ناوەندە خەرج و هەزینەی پێویستوەک خەرجی فۆتۆکۆپی و زیراکس و پۆست و شتی وا وەعۆدە دەگرێ .

چاوەڕوانی ئاگاداری و یارمەتی ئێوەی خۆشەویستین .

---

تکا لەخوێنەرانی بەڕێزی سروە دەکەین ئەم خاڵانەی خواروو لەبەرچاو بگرن :

١- نووسراوەکان بە خەتێکی خۆش بنووسن وابێ بۆ خوێندنەوەی تووشی گیروگرفت نەبین .

٢- لە دیوێکی کاغەز بنووسن .

٣- ناونیشانی خۆتان تەواو بنووسن تا وەڵامی نامەکانتان بە دەست بکاتەوە

٤- ئەگەر بابەتی وەرگێڕاومان بۆ دەنێرن ئەسڵەکەشی بۆ بەراورد و هەڵسەنگاندن بۆ ئەم ناوەندە بنێرن

٥- ئەگەر دەگونجێ نووسراوەکان لە دوو یا سێ لاپەڕەی گۆوارەکە پتر نەبێ بۆئەوە جێگە بۆهەموو بابەتێک ئاواڵە بێ .

٦- دەستەی نووسەرانی سروە وەک گۆوارێکی فەرهەنگی-ئەدەبی دەتوانێ لەباری رێنووس وڕێزمانەوە دەست لە نووسراوەکان وەربدا .

٧- ئەو بابەتانەی بۆ ئێمەی دەنێرن لەبابەکانی-دا هەڵدەگیرێ و نادرێتەوە بەخاوەنی تکایە نوسخەیەک لای خۆتان رابگرن .

دەستەی نووسەرانی سروە

# ئاران

**پەرویز جیهانی**

ل گەلەک کتێب و پەرتووکێد میژوویی* دا ئەم زۆرجارا راستی گۆتەیا "ئاران*" دێن، کو بۆ وەلاتێ لایێ رۆژاڤایا بەحرا کاسپین (خەزەر) و قەراخێ چەمێ ئەرەز هاتیە گۆتن.

هەریەک ل میژوونڤیس و لێکۆلا ب جورەکی ئەڤ گۆتەیا کوردی مەعنی کرنە ل ناڤ پەرتووکێد میژوویی‌دا گۆتەیا "ئاران" ب ڤان جورانە دێنە خوویان.

ئاران ـ ئەران ـ ئەلران ئاغوان ـ ئاغوانک ـ ئالوان ئالان.

ل فەرهەنگا فارسیە موعین دبارا گۆتەیا "ئاران"دا ئەم وەها دخوونن:

"ئاران = ئالان = ئەلان ئار. "ئاریا + ان. پاشکۆیا* جی")

ئەردەکە ل باکوور رۆژاڤایا ئیرانێ ورۆژاڤایا بەحرا خەزەر ل قەفقازێ. ئوورسا ناڤێ وی ئەردی کرنە ئازەربایجان. بازارێد وێ یە مەزن وبناڤ و بانگ ئەڤەنە:

باکوو، گەنجە، شەماخی دەربەند ونەخشوان، بەردیعە (بەردوا) بازاری وێ یە میژوویییە.

یوونانی ورۆمیێد بەرێ دگۆتنێ "ئالبانیا". ئەرمەنی دبێژنێ "ئاغوانەک" عەرەبا ژی ناڤێ وێ گوهۆڕینە کرنە "ئەران".

میژوونڤیسەکی ئیرانیێ ژی گۆتنێد ژۆرین ل نڤیسارێ خوەدا دینە و لێ زێدە دکە کو گۆتەیا "ئاران" ل زمانێ خەلقێ ئازەربایجان و ئەرمەنی و ئارانا کاشانێ دا یانێ گەرمیان. ئەو ل سەر وێ باوەرێ یە کو پەیڤا، "ئاران" ئەڤێ مەعنیێ نادە بەلکوو ئەڤ پەیڤا ژ گۆتەیا "ئار" سەڕاست بوویە کو ناڤێ گەلێ ئاریائیە.

"عینایەتولاهێ رزا" ل پەرتووکەکی بناڤێ ئازەربایجان و ئاران دا دنڤیسە، ئاران هەمان ناڤێ ئالبانیایا قەفقازێ‌ـ یە، کو هاتیە گوهۆڕین.

میژوونڤیس ولێکۆلەکی دی بناڤێ "مارکوارت" دنڤیسە ناڤێ ئالبانیایێ کو ل نڤیسارێ میژینە یوونانی و ئەرمەنیادا هاتیە، دگەل ناڤێ "ئەران" و "ئەڕانێ" کو ل نڤیسارێ عەرەب و گورجادا هاتیە، هەیەکە.

"ئیبن فەقی" خودانێ کتێبا بناڤ و بانگە "ئەلبولدان" کول کوتایا سەدەیا سێ یێ کۆچی دا هاتیە نڤیسین، وەلاتێ ئەرمەنستانێ دکە چار پشکا. ئەو عەردێ ئارانێ ژی سەر ئەرمەنستانێ دهەژمێرە.

"**موقەدەسی**"ل پەرتووکا "**ئەحسەنوتتەقاسیم...**" ل بارا "**ئارانێ**"دا دنڤیسە:

ئاران عەردەکی ئادەکی یە* ل ناو بەندا

**بەحرا خەزەر** و **چەمێ ئەرەز** کو **چەمێ کور**ئەوی عەردی ڤەدبڕە. ناوەندا وی وەلاتی بازارێ "بەردعە"یە. ئەوژی بازارێد کو **موعین** گۆتنە دگەل بازارێد "کەلاخنان" **و** "مەلازگر" (بەلاش گرت"ێ ژی سەر ئارانی دهەژمیرە.

"**ئستەخری**"کودنیاگەڕەکی بناڤ وبانگە بەرێ یە ول سالا **٣٤٦** کۆچی دا مری یە ئاران و ئازەربایجانێ لێک جودا دزانە.ئەو دبێژە کو"**بەردعە**" ناوەندا ئارانێ و"**ئەردەبیل**"ژی ناوەندا ئازەربایجانێ یە. ئەو لایێ رۆژئاڤایە بەحرا خەزەر "**ئاران**" دزانە .

"**یاقووت حەمەوی**" کو ل سەدەیا هەفتێ کۆچی دا ژیایە، ل پەرتووکا "**موعجەمولبولدان**" ل بارا ئارانێ دا دنڤیسە:

ئاران ناڤەکی ئیرانیە وەلاتەکی بەرفرە وخودانێ گەلەک بازارایەکو یێک ژوان بازارا "**گەنجە**"یە. ناوبەندا ئازەربایجان و ئارانێ دا چەمەک دەرباس دبە بناڤێ **چەمێ ئەرەز** . ئاران ل باکوورورۆژاڤایا ئەرەز، ئازەربایجان ژی دکەڤە بنتار و باکوورا وی چەمی .

ل پەرتووکا "**تەقویمولبولدان**"دا هاتییە کو ئاران وەلاتەکی بناڤ و بانگە کو هەڤ سینۆرێ ئازەربایجانێ یە "**حەمدولاهێ مەستووفی**" ل پەرتووکا "**نوزهەتولقولووب**"دا دنڤیسە:

عەردێ ناوبەندا دو چەمێ ئەرەز و کور"**ئارانە**"

هندەک ژ لێکۆلا ژی "ئاران" و"ئالان"ێ هە یێک دزانن. لێ"**عینایەتولاهێ رزا**" دنڤیسە کو ئالان ناڤێ ئارانێ نینە. ئەو دنڤیسە کو ل باکوورا قەفقازێ بگرە حەتا گەلیێ داریالێ وەلاتێ ئالانێ یە.

"**ئوستادبارتۆلد**" رۆژهەلاتناسێ ئوورس "ئاران" و "ئالان"ێ ژێک جودا دزانە ئەو دبێژە کو ئالانی قەومەکی ئیرانینە .

ئەمما ئەم بخوەژی دەبیا بزانن کانێ ناڤێ "ئارانێ" چیە، ژ چ هاتییە گرتن، کیدەرێ یە، کەتییە کی ئالی ؟ و....

ئیرۆ پشکا زۆرەکورمانجا بتایبەت کورمانجێ ژۆرین ناڤچێد گەرمیان را "**ئاران**" دبێژن .ناڤچی کێوستانی راژی دبێژن "**زۆزان**" .

گەلێ کورد کو ل سەر زنجیرە چیایێد ئارارات-زاگرۆس دا دژین ، ل دەورێ بەرێ کۆچەر بوونە. هەروەکی نهەژی ل پشکا زۆرە کوردستانێ دا گەلێ کورد کۆچەری یێ دکن . هاوینان ل پێسیرا چیا و کۆستان و زۆزانان دا کۆن و چادورێ خو ڤەدگرن و ل دانێ زستانێ ژی دگەل پەز و کەری یێ خو بەرب گەرمیانێ دچن.ئەو کوردێ کو ل پشکا باکوور وباکوور-رۆژهەلاتا کوردستانێ دا دژین، دانێ زستانێ ل رەخ چەمێ ئەرەز هەمان ئەو جیهێ کول مێژوویێ دا بناڤێ ئارانێ هاتییە ناسین جی وار دبن .

ئەمما ئەو کوردێد کو ل لایێ باشوور رۆژاڤا و رۆژاڤایا کوردستانێ دا دژین زستانێ دچنە سینۆرێ ناوبەندا تورکیا وسووریایێ ل دەشتا "**حەڕان**"ێ دا دمینن یانێ ئارانا وان دەشتا حەرانێ یە .

لێرەدا دوزومەسئەلە یەک هەرە گرنگ* بیروڕایا مرۆڤ سەر خوەدا رادکێشە. گەلۆ گۆتەیا "**حەڕان**"عەرەبی بوویا گۆتە و پەیڤا "**ئارانێ**" نینە؟ ئەڤ دەبە* ل زمانێ عەرەبی دا هەیە. ئەوانا هەر گۆتەیێ بلی عەرەبی دبنە سەر رێزمانا عەرەبی و وەکی گۆتەیەک عەرەبی چێ دکن و ئەوێ

یەکێ راژی دبێژن **تەعریب** و گۆتەیا تەعریب بوویی راژی **موعەڕەب** دبێژن .

فەرهەنگا موعین و فەرهەنگا ئەلمونجد ژیر ناڤێ **"حەرانێ"**دا دنڤیسن. حەڕان باژارەکی مێژین* و بناڤ وبانگ بوویە کو ل ٣٥ کیلومیتری یا باشوورا ئوورفایێ دایە. ئیرۆ حەڕان گوندەکی کاڤلەو..."*

ئەمما هندی ئاگاداریێا مە هەیە و ئەم دزانن **"حەڕان"** دەشتەک گەرم و گەرمستان و مەزن را دبێژن کو کەتییە باشوورا تورکیا وباکوورا سووریایێ و جیهێ ئارانا کوردانە.

تشتا کوجیهێ سۆسرەت وزەندەمانێیە وبەرا مرۆڤ سەرخوەدا رادکێشە ئەڤەیە کو دو گۆتەیێ **"حەڕان"** و **"ئاران"** هەردووک ژی ئارش ومەعنی یا گەرمایێ وجیهێ گەرم وگەرمیانێ ددن :

گۆتەیا **"ئاران"** ژ دو پشکا پێک هاتییە: (ئار + ان ) **"ئار"** ل زمانێ کورمانجی دا یانێ ئاگر. نەهەژی پشکا زۆرە کورمانجا ئێکر را "ئار" دبێژن. ئاگر ژی نیشانەیا گەرمایێ یە. "ان" ژی ل کورمانجی دا هەم نیشانا پاشکۆیا جی یە هەم ژی نیشانەیا کۆمی یە. ( علامت جمع )

**"حەڕان"**ژی ل زمانێ عەرەبی دا هەڤێ مەعنی و ئارشێ ددە.

ئەگەر پاشکۆیا "ان" ژ گۆتەیا "حەران" بێ راکرن و هلدان "حەر" دمینە کو ل عەرەبی دا یانی"گەرما" بڤێ ڤەژاندنێ ئەم دشێن بێژن کو**"حەڕان"** هەمەن گۆتەیا **"ئاران"**ە کو هاتییە تەعریب کرن .

ناڤێ چییایی **ئاراراتێ** ژی کو زەمانەکی ئاگراوێژ بوویە وکورد نەهەژی ژێ- رادبێژن **ئاگری** و تورکا گوهۆرینە کرنە " **ئاغری**" هەر*ئوسا ناڤێ چەمێ **ئەرەز** یان **ئارازژی** ژ گۆتەیا ئار پێک هاتیە کو مەعنی و ئارشا ئاگروئاگرینێ تێدا بەر چاڤا دکەڤە .

ئەمما ئەم بزانن کانێ **"ئالان"** کیدەرە.گەلۆ"ئالان" ژی هەمان "ئارانە" کو هاتییە گوهۆرین یان ناڤچە و وەلاتەکی دی یە. هەر ئوسا کو پێشدا هاتەگۆتن ناڤچە یان وەلاتەک ل باکوورا قەفقازێ دا هەیە کو دبێژنێ "ئالان" .

ل فولکلۆرا کوردی دا ژی مەسەرهاتی و بەیتەک زۆر جوان وخۆش و بناڤ ودەنگ هەیە بناڤێ" **مەمێ ئالان**"کو ئەڤینداریێ"**زینێ**"یە **ئەحمەدێ خانی** هوزانڤانێ مەزنە کورد سەرهاتییا وان ب کوردی ڤەهونایە..

ئەمما چ ئشارە ب "**ئالان**" یان "**ئارانێ**" نەکری. ئێدی ئەم نزانن کو"مەمێ"ئارانی بوویە، یان ئالانی، یان جیهەکی دی رابوویە. ئەمما ل کوردستانا عیراقێ دا ناڤچەیەک بناڤێ ناڤچا "ئالان" هەیە. هەرئوسا "ئالان" گوندەکەل کوردستانا ئیرانێ سەر ب باژارێ سەردەشتێ.

نەهە رۆن نینە کو مەمێ ئالان ژ کیشک ناڤچێ رابوویە. ئەمما ل جیهەکی ل بەیتا مەمێ ئالاندا هاتییە کو مەمێ کورێ پادشاهێ **مەشرق زەمینێ** بوویە. نەهە ل پێسیرا چییایێ ئاگری لایێ باشوورێ ل ناڤچا **"بۆرالان"** یان **"دامباتێ"**دا شوونەوارێ باژارەکی کو دبێژن ل ژێر ئاگرئاوێژیا چییایێ ئاگریدا کاڤل بوویە، بەرچاڤا دکەڤە. ئەڤ مەسئەلەیە مرۆڤ دینە سەرڤێ بیر و رایێ کو "ئالان" ئەو جیهێ کو مەمێ لێ را بوویە دەبێ کو هەمان "ئاران" بە. هەرئوسا بەیتا " مەمێ ئالان" پشکا زۆر ل ناڤ کورمانجێ ژۆرین دا هەیە. هەمان ئەو کورمانجێ کو گەرمیانێ خوەرا **ئاران** دبێژن .

# سەرهاتییا گیکۆر ۲

## کافی رێبسار ئینایە سەر رێنڤیسا کوردی

دیتن کو مالدا نکارە
قولخ (خزمەت) بکە، گیکۆر
برنە دکانێ، وێ دەرێ
گەرەکی ئەشیایێ بکر چییا
ببرا، گۆتی :

ـ چیت قات کرا، دکان
تەمز کرا، لێ وەختێ
ڤالا بوو یاژی گەرەکی
گازی بکر چییا بکرا."

ئاها گیکۆر نان دبە
دکانێ،دەردانا خارنێ
دەستی دا، بەلەنگاز، رەنگ
لێ چوویی ملاسێ تەرکی
(زۆر مەزن) عەردێ راکاش
دکە وسەرپرێ را دچە.ژێرێ
نهێرێ ئاڤ گوژە دیوارێ
کارڤانسەرێ یێ بلند دکەت
قولۆز* دبوو،ئستویێ هەڤرا
دچوو، دهات ،دبوو گێژ-
گەرین و تە دگۆت قەی ژ
زەرپا دخەنقە،بن پرێ دا
نەرم دکرە خوشین .

نێزیکی کەنارێ چێم
(چەمی) قەیکەکە شین دوور
هەڤ دچوو، دهات .

دو مەری وێدا هەبوون
یەکێ تۆرداڤیتێ، یێ ماین
ژی قەیک داژۆت :

ـ "ئای وێ نها دەرینە..."
گیکۆر گۆت :

وجیدا سەکنی(راوەستا)
ول تۆرچی یا مێزە کر....
تۆرڤالا (خالی) دەرکەت .

ـ" ئەڤا ژی سەربەختێ
من ."

گیکۆر گۆت وگاڤا جارەکە
ماین تۆرکشاندن ،بەختێ
گیکۆر پووچ دەرکەت .

ـ "ئەڤا ژی سەربەختێ
زانێ یا مە."

ئەڤا ژی پووچ دەرکەت .

"ئەڤا ژی بەختێ گالۆ"

گالۆ ژی بێ بەخت بوو.

" ئەڤا ژی بەخ..."

لێ وی چاخی بەردەرێ
کارڤانسەرا نێزیک بوو
قالمەقالم (قەرەبالغ)

مێرکەکی بکلام مەیموونا
خوە ددا رەقاسێ( وژێرا
دگۆت) :

**هەی لێ وەرە لێ مەیموو ن**
**شقک دارا چییێ مەیموو ن**

جەماعەت تۆپی سەرسەرێ
وی ببوو ،هەلا چار ئالی یا
ژی بەرب وی دڕەڤین.گیکۆر
ژی رەڤی .

خوەست بکەڤە ئۆرتا*
جەماعەتا سەکنی، پێشدا
هەرە، لێکار بوو ،ئستویێ
خوە درێژ کر ،سەرپێچی* یا
(تلییا ) سەکنی و خوەست
مقیم ببینە ،جکا ئۆرتێدا
چ دقەومە .

ـ خوە چ بەرا دکی
لو...هەرە شوخولێ خوە .
کینتۆکی گۆت و تەپەک*
داناڤا چەعقا .

گیکۆر نشکێڤا سەرهشێ
خوە داهات و بەر ب دکانێ
رەڤی .

ئێڤارێ گیکۆرئاسپێژخا-
نێدا قنجلی بوو سەرهەڤ .

سەر سوورەتێ وی هەلاهێ
هێسر (روندک) زها ( حشک )
نەببوون. هەلا دەوسا شەماقێ
خەزین دشەوتین .خانمێ
تەزە دەنگێ خوە بریبوو،
گاڤا "باسۆ" شاگرتێ دکانا
توجار هاتە هوندور، گاڤا
ئەوی گیکۆر دیت ، پێرا
پێرا* سەکنی وبەنگزی یێ
(مەسقەرە وقەشمەری) خوە
پێ کر وبحوکوم پرسی:

ـ چووبووی کولووبێ ؟
لەما د،رەنگ کەتی، کوتکێ
حرچێ ،یانێ شوخولەکی
تەیی فەرز جەم."گوبیرناتۆ"
هەبوو ؟!...

گیکۆر دەنگی خوە نەدکر.

ـ هەلا بێژە کورۆ.....

گیکۆر دەنگێ خوە نەدکر.

-- نزانی کورۆ ، کو
بووی ؟ تە ئیرۆ ئەز
برچینا کوشتم،لی وەکی ئەز
بمراما ؟

ئەوی ئاها خەبەرددا و
هێدی هێدی نێزیک بوو

هەڤەکی سەکنی و نشکاڤا سەرێ گیکۆر خست .گیکۆر ب هەردو دەستا سەرێ خو گرت وخوەدا بە دیوێر (دیواری) باسۆ دخوەست دەربەکی دی ژی بگهینێ، لێ دەنگێ خەزین ژدەرڤا تەسەلە بوو، ئەو دهات .

– تو هەلانها بنهێرە وێ چ بینە سەرێ تە.باسۆ ئەودا ترساندنێ .

–" وێ نها من بکوژن" فکرا گیکۆر رادەرباز بوو ترسا قنجلی سەرهەڤ.خەزین دکانێدا ئەوئێدی ئێپێجەیی* (زۆر) کوتابوو نها تەنێ ئەمر کر نان نەدنێ،وەکی زانبە برچیبوون چییە . قەزییا دەرباز بوو.

گیکۆر دەمێنی*،لێ دیسا دەنگێ خانمێ گوهادا بوو کو دکرە قاژین :

"ئاخر چرا خوەیی دکی، بەردێ دەرخە، برا (بلا) هەرە،ئوندا بە، بەردێ دەرخە..."

گیکۆر بن لحێفێدا قنجلی سەرهەڤ ، سەرێ خوە کرە بنی، خوە ڤەشارت .

**"هیڤەرۆنە ،خەو ناکەڤە**
**چەعڤێ من**
**ئاخ خەلقێ ژی ترێ**
**تونەمالامن**
**وەی مالا من مالا من...**

باسۆ هەی دستراو پێرا ژی نان دخار.جارنا گیکۆر هێدیکا سەرێ خوە بن لحێفێدا دەردخست (دەردانی) دزیکاڤا وی دنهێری.جارەکە دن چەعڤێ خوە دگرت،ئەوی وێ رۆژێ نان نەکربوو دەڤێ خوە.خەواوی نەدهات .

– هێ چاوانە، برچینا خەوا تە نایێ ئەرێ؟......

باسۆیێ نەعس تەخمین کر و پاری نان وپەنیردا گیکۆر دەهلدە،جیایدا دزیکاڤا بخوە،خەزین براپێ نەحەسە .

گیکۆر نان و پەنیر ژ دەست رەڤاند، سەرێ خوە کرە بن لحێفێ، دزیکاڤا خار وفکری،گاڤا کەوشەنێ* گوندێ خوەدا

خوەرا ئازا دلیست وتێر نان دخار، دەرهەڤا وان ئێڤارادا دفکری، گاڤا دێ

و باڤێ وی دکرنە شەر بۆنا برنا وی یە شەهەر.. دی یا وی دگرییا و نەدخوەست ...

– ئاخ دایێ حان، دلێ تە چاوارند زانیبوو.

– گیکۆر ناڤا جیدا کەسەر رادهیشت ، نان و پەنیر دخار و هەی ژی گوهێ خوە دابوو سەر، جکا خەزین خوە نایێ.... لێ سبەترێ بەردەرێ دکانێ بوو.

گیکۆر بەردەرێ دکانێ سەکنی بوو، دکرە گازی ، گازی بکر چییا دکر و ب دەنگەکی بلند پەیی ئەشییا ددا .

– کۆرۆ تێکە گازی،ئێ چ زارزمان کەتی،سەکنی یی چ لالۆمە دەڤێ تە کەتییە؟

– کەرەمکن وەرنە ڤرا ، کەرەمکن وەرنە ڤرا ! ...

گیکور دکرە گازی :. دکانێدا کەنا دکەتن . ئەو هین کربۆن وەکی بکرچی یا کاشکە، بەر ب

کنجێ* وی ژی هاتبوونە گوهاستنێ. مەری یا چەتن (دژوار) ئەو ناس بکرا.
– کورۆ ئەڤ مەریکی تامە...هەلا کنجی وی.تمتێلا* وی بنێرە ...
گوندی پێ شا دبوون.
– وەی لێ خوەلیێا هامبۆ سەرێ مەبوویی،هەی بنهێرە ئەوی کورێ خوە گیهاندە کو.لێ زارێ مە گونددا خنزیرا (بەرازا) دچێرینن.
لێ گیکۆر ژی سەرهەڤ دپرسی:

دکانێ بینە. ئەوی هەرتم پێشی یا ڤی یانێ وی رێڤی یی دگرت،بەرک(قاحیم) کاش دکر، بەر ب دکانێ دئانی و ئەو بەرنەددا، حەتانی مێرک هێرش* دکەت. دیسا دهات جییێ خوەدا دسەکنی ودکرە گازی.
رۆژێد هاڤینێ یە، گەرم وەختا گەلەکی بەر دەرێ دکانێ دسەکنی و دوەستییا، ئەوجارنا سەرچیتێ بەردەرێ دکانێ قات کری روودنشت و خەورا دچوو. وی چاخی هەڤالێد وی یە نەعس یانێ ژی جینارا برنۆتی دکرنە پۆزێ وی. ئەو دبێنژی و ژجی ڤەدجنقی.
توجارێ کو ژ گەرمێ عەجز ببوون،دکەنییان، لێ خەزین ژی تێردکەنییا و پاشێ دپرسی:

– ئێ لۆ کوتکێ حرچا نو رادزیی، تێکە گازی، ئی؟.....
کەرەمکن،وەرن ڤرا.... کەرەمکن وەرن ڤرا!"
گیکۆر دکرە گازی.
رۆژەکی ژی وەختێ گیکۆر گازی بکر چیپا دکر، دو گوندی وێدا هاتن، ئەو رەڤی وخو هاڤیتە پێسیرا وان.
– کورۆ قەمن ناس نەکر ئەڤ چ تەڤایە(دەعبا) گوندیکی ب عەجێب مایی کرە گازی وگۆتە هەڤالێ خوە:
– باغۆ تەیێ ناس بکرا؟
– منی چەعڤاڕا ناس بکرا،هەڤال قورە بوو.
راستی ژی گیکۆر گەلەکی هاتبوو گوهاستنێ،گەلەکی بەلەنگاز ببوو، ئەو ژی

دییامن چاوانە؟...زارێ مە چاوانن؟..." باڤێ من چرا نەهات؟... چێلەکا مە زایە،یانێ نا؟........ گوندێ مەدا کێ مری یە؟...
گژک ژی پاکن.گوندی یا گۆتنێ.گەلەکی تەسلاڤ دکن تەنێ"سوکناسن گوکاس" ویەک ژی پیرا"بوچورانس" مرن. یێ دنێ* تەمام ژی پاکن.
– لێ باڤێ من چرا نایێ؟
– باڤێ تە زەعف* دخوازە لێ وی چاوا بێ...مەریکی تەنێیە،قارانییا مالێ تەمام ئستویی ویدانە...
– لێ تشتەک نەشاندنە؟
چییێ وان هەیە،وەکی چ بشینن،تو حالێ مالا وە نزانی؟ ئیسال ژی نان گرانی بوو،باڤێ تەیی

بەلەنگاز ئانجاغ( بزۆرێ ) رێ دبە.تو چ ژوان دخازی ؟ هەرگی (ئەگەر) تشتەک دەستێ تە دایە،توبشینە... کاپکەک پەرە دێستی داتونە.

– خوە مالا مە کەس نەخوەش نەکەتییە؟

– نا تەنێ چیلەکاوەیە "ساغیک" کولەکا گۆما میرزەدا کەت وحشک بوو....

– "ساغیک " حشک بوو؟!

دی یا تەیە بەلەنگاز ئەوقاس گرییا ، چەعف لێ وەرمین. گوندیکی ها گۆت و نەمەک(نامەیەک،) دەرخست و دا گیکۆر وگۆتێ:

– لێ تو نها چ دبێژی ؟ ئەم ئێدی تە نابینن ئەمێ هەرن،هەرگە تێ تشتەکی دییا خوە، یانێ خووشکا خوە رابشینی ،بدە ئەمێ ببن (بهەرن) .

– ئەزێ کوبشینم. ئەز هەلا پەرا ناستینم.لێ...

– لێ چ ؟....

– ئەز دخازم وەرابیم. من گەلەکی هەم بیرا گوندێ مە،هەم ژی بیرا مالا مە کرییە، هەم ژی....

– پەی،پەی مەژی هەو زانبوو بوویی مەری،ئاقل بوویی، لێ مەری تشتێ ئوسا دبێژە؟ ڤێدەرێ خوەرا مینانی(وەکی) ئاغا دەرباز دکی، کنجێ تە تەزەنە، دەست پییێ تە تەمزن ... ئەم دبێن وەکی تو زارێ مەژی بینی جەم خوە،جیکی... ئەو تو چ دبێژی؟ وەکی گۆتنە :

"سەرێ خنزیرێ دانین
سەر خالیچێ ،گولۆل بوو
کەت ناڤا حەرییێ."

راستی بۆنا تەگۆتنە.

گوندی ها لێ هلاتن شیرەت کرن ،خاترێ خوە ژێ خوەستن و چوون.

پەیی چوییینا وانرا، گیکۆر قونجکێ خوەداروونشت ونەما باڤێ خوە ڤەکر.

**"کورێ منی عەزیزگیکۆر جان ،بەر باژارێ تفلیسێ"**

**ئەم ساغ وسلامەتن،تەنێ ساغی یا تە دخازن.ئامین. ئەدێ تە، دییاتە، زانێ مووسی، میکیچ،گالۆ تەمام تە بارا،جەما سلاڤ دکن. کۆرێ مەیی عەزیز گیکۆر، زانبی وەکی ئەم گەلەکی دەست تەنگن و مەفەرامە برینە... ئەم پەرا دەست ناخن دییا تەوزانێ تەعزینە (رووتن)ئەم گەلەکی دەست تەنگن، گیکۆر جان چەند مانات پەرە بشینەو کاغەزەکی بشینە،جکا حالێ تە چاوانە ؟**

**زانبی وەکی " ساغیک" حشک بوو، دییا تەوزانێ تەعزینە.**

**"باڤێ تە هامبۆ"**

گیکۆر نەمە خوەند جیدا بوو روساس و فکری. ئەو بونا مالی بەرخوە دکەت .خەتێ نەمێ دلێ وی دشەوتاند.

– دییا تەوزانێ تەعزینە، ئەم گەلەکی دەست تەنگن...

– کۆرۆ تێکە گازی، چ مالوق(مت ومات ) مایی هشێ تە وانرا چوو ؟ ژ هوندورێ دکانێ کرنە گازی.

– کەرەمکن وەرنە ڤرا کەرەمکن وەرنە ڤرا،گیکۆر بەردەرێ دکانێ سەکنی بوو دکرە گازی :

زڤستان هات . شەهەردا ڤزینی یا باگەرێ بوو.کوچا دا بێ دکرە ڤزین وگوژین و دکرە باگەر.حەموو قولچ و بوجاخا باگەرێ دکرە ڤزین. مەرییێ بەلەنگاز و تەعزی،زارێ خەریب و بێ خوەیی دگەرییا .

ئاها گیکۆر دیت .

بلووزەکی تەنک لێ بەردەرێ دکانێ سەکنی و دکرە گازی :

–" کەرەمکن وەرنە ڤرا، کەرەمکن وەرنە ڤرا ا...

ف... ف... ڤایی... سورێ وسەرمێ ب تەمامی کرەفیتین ،مینانی جورەکی لێخست کەتە ناڤاهەستوویا گیکۆر رجفاند... خێنجی وی ژی، ئەوگەلەکی بەلەنگاز ببوو، ئەڤا ژی ژێرا بەس بوو.

و کەتە ناڤا جییا...

گیکۆر ئاسپێزخانا ئارتێمێ توجاردا نەخوەش

کەتبوو ناڤا جیيا .دێدێ یا
پیر رۆژێ چەند جارا دهاتە
هوندورو خوەبەر خـــوەدا
خەبەر ددا .

_ چ دخوەزی گیکـــۆر
لاوو ؟

_ ئاڤێ ...

دێدێ یا پیرئاڤ ددایـێ
نەخوەش بدەستێ رجاف ئاڤ
ژ دەستێ پیرێ دگرت ،عەج
عەج (لەزلەز) ڤەدخار و
جارەکە مایین دخاست .

**_ دێدێ ئەڤا دلێ من
هێنک ناکە... ئـەز ئاڤـا
کانیيا مەیە سار دخازم ،
دێدێ... ئەز دخازم هەرمە
مالامە... ئەز دیيا خوە
دخازم...**

ئارتێمێ توجار کەتبوو
خەتایێ. ئەو ڤردا_ وێدا
چوو، هات مەریک(مرۆڤەک )
ژ ئالییێ وان دیت .جابکر
وەکی هامبۆ بێ،لێ گیکۆر
ژی بره نەخوشخانا شەهەر.
وێدەرێ رەخ هەڤ پالدایی
گەلەک نەخوەش هەبوون. وا-
ناب زەلوولی دکرنە ،نەعلە
نەعل(نالەنال) . هێسیر ،
هێسیر بانێ ئۆتاخێ دنهێن

گیکۆر ناڤا گەرمێ دا
بوو ،هاتنا باڤێ تێ دەرنە-
خست .

گیکۆرجان ،نەئەز هاتمە
ئی... گیکۆرجان... نە ئەز
ئەدێ تەمە...ئی...

نەخوەش تشتەک فەعمـــم
(فام) نەدکر .ئەوی بەربەستا
دکرە گازی: "میکیچ، زانـێ
ئەدە، ئنێ ..."

_ ئەز ڤێدەرێمە ،گیکـۆر
جان ،دیيا تە ئەزشاندمە
وەکی تە بڤمە(ببەم،بهەڕم)
مالامە... تونایێ؟..ئی وێ
میکیچ وزانێ سەرکولەکـێ
چەعڤنهێرێ یا تەنە. تو چ
دبێژی؟ دە خەبەردە ئـی
گیکۆرجان ...

_ کەرەمکن وەرنە ڤرا ،
کەرەمکن وەرنە ڤرا! ....

نەخوەش سارۆبارۆ خەبـــەر
ددا وبەربەستا دکەنیيا .

رۆژەکی دوڤا شوونـــــدا
هامبۆ دچوو گوندێ خوە.
ئەوی گیکۆر حەق کربـوو ،
دچوو. کنج (جل و بەرگ )
دابوو بنچەنگا خوە ودبـر
وەکی دێ سەروان شینێ بکە
جێبا (جیڤ ،بەریک) وێدا
چەنگەک بشکۆکـێ برقـۆک
کاغەزی نەخش ،چەند پرتـی
چیت وچەند بلاڤکە دیتن .
دبە ئەو ژی بۆنا خووشکا
خوە زانێ تۆپ ( بەرەڤ )
کزبوون،خوەیی کربوو...

هامبۆ دچوو ،دفکری،گەلە
وەعدە دەرباز نەبـوویـە.
گاڤا هەماوێ ری یـــێ را
گیکۆرێ خوەرا تـەڤـایـی
هاتە شەهەر:

_ ئای ڤێدەرێ بـــوو
وەکی: گۆت :

_ ئەدە لنگێ من دێشە..

ئای ئەوا داراهان بوو
وەکی بندا روونشتن، هێسا
بوون... ئای ڤێدەرێ بـوو
وەکی گۆت :

_ ئەدە ئەز تنیمـــە
(تیهنی مە)...

ئای ئەڤا کانیيا هـان
بوو ،وەکی ئاڤ ژێ ڤەدخارن.
گشک ،گشک (گژک ، هەموو)
هەنە تەنێ ئەوتونە....

رۆژترا مایین وەختـــا
هامبۆ ناڤا چیيارا دەربـاز
بوو، دوورڤا گونـدێ وان
هاتە کفشێ .

دیيا وی،زانێ،میکیـچ
مووسی پەرێ گونـد سەکنی
بوون و هیڤی یێ بوون،لێ
گالۆیێ بچووک حـــەمێـزا
دێ دا دکرە گازی:

_" وەلە ،وەلە، هەی
گیکۆل ..."

تێبینی : لەپڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بەپێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆواره ڕەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی (٧) دانەنراوە . واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی ( شڕ، کوڵ، زۆڕ، شەڕ و . . ) ی تێدا بێ بە شکڵی ( شر، کول، زور ، شەر و . . ) دەنووسرێ .

١- مامۆستای شاعیرانی موکریان - مار خۆشی ناوێ ٢- ئی ئازایان بەرزە- ڕاوێژی ئەلف وبێ - جێگەیەک کە دوو یا چەند ئاو تێکەڵ دەبنەوە ٣- قەدر و ڕێز- بەزۆران نەردیوانێکن - لک ٤- دانەی ڕۆندار- ئێلێکی بەناو بانگی کوردە و شاعیری وەک فەقێ قادری لێ هەڵکەوتووە ٥- بابۆڵەی شوان - وەختی هاتووە- زەوی کێڵدراو ٦- گوندستێنی بەناوبانگی نەغەدە ٧- ڕێڕەوی حەزرەتی مووسا ( د.خ ) نیشانەیەکی جەمعی فارسی - کش و مات ٨- بەرانی سێ ساڵە- قنج و بەکەیف- تووڕەیی - بێدەنگ ! ٩- لە خەشخاش دەگیرێ - ناوی بچووکی نووسەری بەناوبانگی تورکیا ١٠- نیوەپایە- میوەی تازە گەیشتوو- نەخۆشی بەڵەک ١١- دەستی عارەبان - جێی دیتن و ئاخاوتن و دڵداری - تاوتێ ١٢- هەرچونێک بێ هەر جوانە- جێی پەڕینەوە لە چۆم و ڕووبار- وێراَن و خاپوور ١٣- لێی گەڕێ - سوکنایی دەخاتە دڵی چاوەڕێ هەوای بێ هەور ١٤- توند- نیوەبار- پۆلەداری بچووک کە زۆر هەڵنەدا - دۆستی جگەرە ١٥- چیا و ڕاز- دەنگی هەوێردە- مەکتەب .

١- ناوچەیەکی هەراو لە سەردەشت- کەزیە ٢- گێژ وکاس- دوو جار پیتێک بەستەیەکی کوردی یە ووەکی دەڵێن پاشماوەی نیایشی ئەهوورایە ٣- هەنجیر -ێکی خۆش ونەیاب- هەگەر وبنۆس- دووەم کەس ٤-گیانباری دەریا- حەسانەوە ٥- خوای دەروێش- شاری حاجی قادر- پەیمانی ڕۆژهەڵات ٦- دەمگۆ و تەشەر سەگی یانی گر- دۆستی یاڵ -گیانباری بێ پێ ٧- شارێک لەنێوان کرماشان وهەمەدان خانووی هەوار ٨- عوسمانی خۆماڵی - شەتڵی لێ دەچەقێ -. پێشگری فیعلی موزاریع ٩- گەورە و بچووکەکەی دوو چۆمی بەناوبانگن - وەتاغ - نەفەس ١٠- دۆستی تان - حەشارگەیەک لە ڕاوە کەودا- ئاوی گەرمی مەعدەنی ١١-ناوچەیەک لە نێوان سەقز وسنەدا- دەڵێن بنی زۆر شیرینە- پەز ١٢- ئاسەواری گریانی زۆر- تەگبیر- چاوە ١٣- زگ - مەکۆی ئەوین - دووپاتەکەی نیشانەی شین. و شەپۆڕە- پووڵی ئێران و حیجاز ١٤- مووی ملی شێر وئەسپ - بەلووتی قسە دەکا- دۆستی سوورا و- واش هەر چاکە ١٥- ناوێک بۆ کیژ- قەدیم دەیانپەرست نەژاکاوی تورک .

لەنێو ئەو کەسانەیدا کەپڕکراوەی ئەم ژمارەی سروەمان بۆبنێرن، یەک کەس بەپێی پشک بەبەرەندە دەناسرێ. بەمەرجێک ئەم خالانەی خواروو لەبەرچاو بگرێ:
١- جەدوەلەکە بەخەتێکی خۆش بنووسرێ وابێ پیتەکان بێنەخوێندنەوە .
٢- ئەسلی جەدوەلەکەمان بۆبنێری لەکاغەزی دیکەدا بەشداری نادرێ.
٣- لانی زۆر پازدە ڕۆژ پاش دەرچوونی گۆوار پڕکراو -ەی جەدوەلەکەی ناردبێ.
٤- پڕکراوەی جەدوەلەکە هەڵەی تێدا نەبێ
جایزەی پڕکردنەوەی جەدوەل ساڵێک ئابوونمانی گۆواری سروەیە .

# شێری دارۆغە

لە وڵاتێکی دوور شایەکی زۆردار و نالەبار هەبوو. هەر کارێکی بە دڵی دا هاتبایە بەکردەوە دەیکرد، بارەگای پڕ بوو لە وەزیر و موشیر و گزیر و سەردار و سەربار و درۆزن .

دارۆغەیەکی بوو بە ناوی " سامڵ" پیاوێکی کەڵەگەت ، چوار شانە ، مل ئەستوور و چاو دەرپەڕیو، بێ کار و بێ خێر، کاری هەر خواردن و نوستن بوو. دەرباریان وایان بیر دەکردەوە کە هێندە بەغیرەتە هەرکات پێی خۆش بێ کەڵ بە چۆک دادێنێ و دێو لە قاف دەردەپەڕێنێ. بەڵام دارۆغە هەر قەڵافەتی بوو، بە کردەوە هیچی لەدەست نەدەهات

زۆر جار دەکەوتە بەر تەوس و پلاری شا . چۆن دەبێ بەو شان و باهۆیە کارێکی شیاوی مەقامی خۆی نەکا و مواجبی مفتە وەرگرێ ؟ لەبەر ئەوە دارۆغە بیری کردەوە کە بێ ئەوەی بشەمزێ دەبێ هێز و توانای خۆی پێشان بدا .

ڕۆژێک دارۆغە لە شاردا دەگەڕا لە پڕ چاوی بە پینەچی یەک کەوت .پینەچی کەوڵە شێرێکی ڕاخستبوو خەریکی کار بوو. بیری کردەوە کە جێگای پیلان گێڕانە نۆکەرەکەی دوور خستەوە و لە کابرا چووە ژوور وبە تووڕەیی پرسی :

- ناوت چیە ؟

پینەچی دارۆغەی باش دەناسی، دەیزانی کەس نیە زوڵم و زۆری وی نەچێشتبێ بە ترسەوە کوتی :

- قوربان ....دەسەرت گەڕێم ناوم... سولەیمانە بەڵام خەڵک پێم دەڵێن وەستا " چەتە" زەکات و ماڵیاتیشم تەواو داوە !

- کارم بەوە نیە ،داهاتی ڕۆژانەت چەندە ؟

- ڕۆژێ شەش قران. زۆر نەدارم.

- ئەو کەوڵە شێرەت لەکوێ بوو؟

- میراتی باب و باپیرمە

- وەستا چەتە بەختت وەخەبەر هاتووە کارێکت پێ دەسپێرم بێتوو بەڕێوەی بەری ڕۆژێ دە تمەنت دەدەمێ.کەوڵە شێرەکەشت بە پەنجا تمەن بۆ حیساب دەکەم !

وەستا چەتە چاوەڕوانی جەریمە و جەزرەبە بوو کەچی ئێستا باس باسی دە تمەن و پەنجا تمەنە !

کەیفی ساز بوو. پیاوی ساویلکە لە کوێی دەزانی " دووگی چەور بێ بەڵا نیە" خۆی هاویشتە بەر لاقی دارۆغە و پێی وابوو پەیوەندی بەکار وباری کەوش و پینەوە هەیە. ئامادەیی خۆی بۆ بەڕێوەبردنی هەموو کارێک دەربڕی.

دارۆغە کوتی :

– کارێکی هاسان و خۆشە! بەیانی ئەو کەوڵە شێرە دەبەر دەکەی گوێت دەگرم بەرەو بارەگا راکێش راکێش بە دوامدا دێی. بەڵام دەبێ چوار پەل بڕۆی بۆ ئەوەی کەس نەزانێ! چون دەڵێم لە راو گرتوومە.

وەستا چەتە کە بە بیستنی دەتمەن و پەنجا تمەن وەک مەستی لێ هاتبوو سارد بۆوە و بە ترس و لەرزەوە کوتی:

– حاشا قوربان! ئەز پیاوێکی پیر و پەک کەوتەم، کۆشێکم منداڵ هەیە دەستم بە دامێنت ئەو کارە بە من ناکرێ و یەکی دیکە بدۆزەوە.

– بۆ بە ئیشتیای خۆتە؟ پێت دەکەم هیچ، چاویشت دەردێنم! لە لای کەسێکیش باسی بکەی زمانت دەبڕم! هەر ئەوشۆ کەوڵە شێرەکە بێنە و وەرە. ئەگەر لە گیانی خۆشت بێ زاری ئەوە هیچ! ئەوەش بزانە کارەکە چەند رۆژ دەخایەنێ دەگەڕێ بەوە سەر کار و کاسبی خۆت ئەوەش سەد تمەن. پووڵەکەی فڕێ دا پێش دەمی و بە جێی هێشت.

وەستا چەتە تا ئێوارێ کاری بۆ نەکرا ئێوارێ بەرەوماڵ بۆوە. لاقی لەدوو نەدەهات! بە هەر جۆرێک بوو هێندێک کەل و پەلی پێویستی بۆ ماڵ کڕی و شەو خێزانی بانگ کرد وکوتی:

– سەفەرێکم لەبەرە. بەڵام منداڵەکانی خۆشمان نەزانن ها! ئەوەش پووڵ دەستی پێوە بگرە. چوون بەدەست خۆمە و هاتنەوە بە خودا. ئەگەر نەشت دیتمەوە دەچی بۆ لای دارۆغە و دەڵێی خێزانی فلان کەسم. بەینمان زۆر خۆشە. دەستت دەگرێ و یارمەتیت دەدا!

وەستا چەتە بێجگە لەوە بە قسەی دارۆغە بکا هیچ رێگایەکی دیکەی نەبوو کەوڵی بە سەر شانی دادا و رۆیشتە ماڵی دارۆغە. بە گەرمی پێشوازی لێکرد پاش ئەوەی خەڵک نوستن کەم وکووری — یەکانی کەوڵە شێریان چاک کرد وتاریک و روونی بەیانی بەرەو کێو وەرێ کەوتن هێندیک خۆیان لە خۆڵ وەردا. دارۆغە کەوڵی دەبەر کابرای پینەچی کرد و هاتنەوە بۆ شار. لە حاڵێکدا وەستا چەتە لە بەرگی شێردا لەسەر دەستان دەرۆیشت و دارۆغەش دەست لەسەر مشتۆی خەنجەر بە دەستێک شێری بە گوێ رادەکێشا! خەڵک کە ئەو دیمەنەیان

دی چوونە بارەگا و گوتیان:

– قوربان بەرگی نوێت مەبارەک بێ دارۆغە شێرێکی بە گوێیان گرتووە و بە راکێش راکێش بۆ لای بارەگای دێنێ!

پادشا تەخت و تانجی لەبیر چوو بۆ تەماشای ئەو دیمەنە هەڵاتە دەرەوە.

بەلێ ، راست بوو دارۆغە سینگی دابۆوە پێشێ و شێری قۆڵەپێچ کردبوو دەی هێنا چۆن .

دارۆغە پادشای دی و هاواری کرد:

ـ گەورەم ، لەوە زیاتر شەرمەزارم مەفەرموو ! ئەوە لە بەختی پادشایە و من کارێکم نەکردووە کەشیاوی زەحمەتی ئێوە بێ .

پیاوانی پادشا وەکوو وەزیر و موشیر و .... زۆریان تاریف کرد.

دارۆغەش دەستی کرد بە درۆ و خۆی گیف دابوو . "وام کرد ووام گرت و ... ! "

دوایە رووی کردە پادشا وکوتی :

ـ ئەو شێرە زۆر درە. کەس باشاری ناکا ، ئەگەر ئەمر بفەرمووی دەیبەمەوە ماڵێ دە قەفەزی دەکەم و هەر کات پێویست بوو دەیهێنمەوە خزمەتت .

دارۆغە خەڵات و بەراتێکی زۆری ، وەرگرت.گوێی شێری گرت و بردی بۆ ماڵی خۆی. وەستا چەتە هەتا گەیشتەوە

ماڵ ئاهی دەبەردا نەمابوو بە حاستەم نووزەی دەهات . کەوڵی دەرهێنا و پشوێکی دا .

شار قاو و راوی تێکەوت ، زار بە زار ئەو باسە دەگەڕا و دەگێڕدراوە کە دارۆغە (ساماڵ) شێری بە گوێیان گرتووە

وای لێهات بە گوێی پادشای دراوسێ گەیشت . وڵامی نارد بۆ پادشا کە. ئێمەش پڵینگێکمان هەیە. کات و شوێن دیاری بکە با بە شەڕیان دەین و سەیریان بکەین .

پادشا کە ئەو خەبەرەی بیست کوتی :

ـ جا شێر و پڵینگ پێکەوە بەشەڕ بێن دڵنیام شێر پڵینگ دەبەزێنێ .

کات و شوێن دیاری کرا و هەر دووک پادشا بەپێی دەسەڵات و توانا سەراپەردەیان رازاندەوە. دەهۆڵ وزوڕناو ساز و نەوازیان هێنا بۆ هان دان و وەدان بە مەیدان داران .

وەستا چەتە بە بیستنی ئەو خەبەرە ئاوی ئەژنۆی رژاو زەندەقی چوو. خۆی گەیاندە دارۆغە و کوتی :

ـ ئاخری بە کوشتت دام ! وەرە، مەردی خودا بە بە هەرچی داوتە بە من کەسمان لە کەس . دەت دەمنەوە ، ئەمن پیاوێکی پیر و پەک کەوتەم خۆ بەری پەلامارێکی پڵینگ ناگرم. کۆشێکم منداڵ لەپاش بەجێ دەمێنێ .

"ساماڵ" خان چاوەڕوانی ئەو رۆژەی نەکردبوو. تازەش کارە هاتووە. دەبێ پینەچی بنێرێتە مەیدان. کوتی :

ـ ماڵت نەشێوێ بۆ ئەوەندە ترسەنۆکی ؟ تۆ شیری ئەو پڵینگە ، هەر

لێی بمرێنی و جارێک وەک شێر بگورێنی هەلدێ و کارت تەواو دەبێ ! بەو قسانە و بە زۆر و زەنگی ملی پێدا هێنا و مەجبووری کرد برواتە مەیدانی پلێنگ .

خەلکێکی زۆر هاتبوونە سەیری شێر و زللەی چاکی لە وەستا چەتە دا. ئەگەر دیکەش بەرەورووویان کەنەوە چون باوەڕی نەدەکرد. لە دلی خۆیدا دەیکوت :

" داخوا چۆن بووە شێر هەلات ".

دارۆغە کە خۆی دەیزانی شتەکە چۆنە چۆوە چادر و بێ هەموو شتێک سێ چوار

پلێنگ و پەلەیان بوو کە هەرچی زووتر شێر و پلێنگ بەشەڕ درێن . تا لە مەیدان بەرەورووی یەکتر رایانگرتن .

جا لێرەدا باسی وەستا چەتە ناکەین چون دەزانین لە رێگا شاد و ئیمانی هێناوە و خۆی بۆ مردن داناوە. بەلکوو چاوێک لە پلێنگ دەکەین کە بەر لە تێبەردانی کز و مات و داماو بە ترسەوە چاو لە شێر دەکا .

کاتێک بەرەو یەکتر بەرێ یان دەکەن زۆر بە شلی قەدەم هەلدێنێتەوە بەلام کە شێر دەبینێ بەو قەلافەتەوە لەو شلترە ! بەتوندی لێی نیزیک دەبێتەوە و هەتا هێزی هەیە دەگورێنی . ئەو کارەی پلێنگ بوو بە هۆی ئەوە شێر پشت لە پلێنگ بکا و هەلێ خۆ دەچادر باوێتەوە !

لە هەر دوو لاوە دەنگی خەلک بلیند بوو لایەنگرانی پلێنگ ئاهەنگی شادی بان لێدا. سولتان بە دیتنی ئەو دیمەنە زۆر تێک چوو، دەستووری دا جارێکی کەولی شێری دەبەر دانەبا سەری هەلدە- قەند. دیسان زۆر پاڕاوە و لالاوەکەلە کۆلم بەوە بە پلێنگم بە کوشت مەدە کاری لە دارۆغە نەکرد و کوتی :

- بێتو نەچی و نەیبەزێنێ هەر ئەو شۆ حەیاتت لێ دەبرم. هەرچۆنێک بوو سازی کرد بچێتەوە مەیدانێ .

شێر هاتەوە لینگی دەلەرزی و بە ترسەوە لە پلێنگ نیزیک بۆوە، پلێنگ لە جێگای خۆی راوەستا تا شێر تەواو لێی نیزیک بۆوە رووی تێکرد و کوتی :

- کورە مال وێران بۆکوێ هەلدێی ! خۆ ئەمنیش شاتری عەبباسی نانکەرم ! کە وەکوو تۆ لە بارەگایان ڕاگرتووم و پادشام پێ فریو دەدەن و نانم پێ دەدەن و نانم پێ پەیدا دەکەن !

وەرە با برێک یەکتر بێنین و ببەین هەم ئەوان دەخافلێین هەم ئێمەش نانێک دەخۆین .

زانستی تیکنیکی

# ئازاره‌باریکه

عه‌تا-که‌شاوه‌رز

له بڕینی ئیشکی ته‌رمه مۆمیاوی کراوه‌کانی میسریانی قه‌دیمرا واده‌رده‌که‌وێ که له دوو هه‌زار ساڵ له‌مه‌و پێشه‌وه ئه‌و نه‌خۆشیه بووه به‌دوای تۆژینه‌وه‌ی*"ویلمن" و "بومگارتن" له ساڵی ١٨٨٢دا "رابرت کۆخ" توانی میکرۆبی نه‌خۆشی ئازاره باریکه* بدۆزێته‌وه.

سێ میکرۆب بۆ ئه‌و نه‌خۆشی یه ناسراون که بریتین له:

١- مایکۆ باکتریۆم تۆپرکۆلۆزیس (ئینسان ده‌یگرێ)

٢- مایکۆباکتریۆم بویس (مانگا ده‌یگرێ)

٣- مایکۆباکتریۆم آویوم (مریشک ده‌یگرێ)

هه‌ر سێ میکرۆب بۆ ئینسان خه‌ته‌ری گیانیان هه‌یه به‌ڵام له‌باری زه‌ره‌رو زیانی ئابووری یه‌وه میکرۆبی مانگا به‌تایبه‌ت مانگای شیری له‌وانی تر گرینگتره به‌راز له مانگا که‌متر و ئه‌سپ و مه‌ڕ و بزنیش له به‌راز که‌متر ئه‌و نه‌خۆشی یه ده‌گرن.

ئاژه‌ڵه‌کانی گۆشتخۆر له به‌رامبه‌ر ئه‌و نه‌خۆشی به‌دا بۆ هێزترن وئه‌گه‌ر شتێکی میکرۆب دار بخۆن یا له ئینسان و ئاژه‌ڵی نه‌خۆش نیزیک بنه‌وه نه‌خۆشی یه‌که ده‌گرنه‌وه.

له (هه‌ل ومه‌رجی)ئاساییدا باڵنده‌کانیش ئه‌و نه‌خۆشی یه ده‌گرن.

ئه‌و مریشکه هیلکه‌که‌رانه‌که‌ته‌مه‌نیان له ساڵێک زیاتره له‌چاو جووجکه گۆشتی یه‌کان زۆرتر ئه‌و نه‌خۆشی یه ده‌گرن.

ئینسان به‌سێ رێگادا ئه‌و نه‌خۆشی یه ده‌گرێته‌وه.

١- ده‌زگای نه‌فه‌س کێشان

٢- ده‌زگای خواردن (گوارش)

٣- پێست.

ئه‌و میکرۆبه زۆرتر له رێگای ده‌زگای نه‌فه‌س کێشا-نه‌وه ده‌چێته نێو له‌ش و ئینسان ئازاره‌باریکه‌ی سیپه‌لک ده‌گرێ.

ئه‌و که‌سانه‌ی ئه‌ونه‌خۆشی یه‌ ده‌گرنه‌وه به کۆخه‌و فڕێ دانی به‌ڵغه‌م و ئاوی زار میکرۆبه‌که له ده‌وروبه‌ردا بڵاو ده‌که‌نه‌وه.

له‌کاتی خواردنه‌وه‌ی شیر یا خواردنی خوارده‌مه‌نی میکرۆب داردا ده‌زگای گوارش* ئه‌و میکرۆبه له به‌ده‌ن دا بڵاو ده‌کاته‌وه. پێویسته بکوترێ که باڵنده‌کان زۆرتر له‌و رێگایه‌وه نه‌خۆش ده‌بن کاتێک که پێستی ساغ یا بریندار له شتێک بده‌ین که میکرۆبی ئازاره‌باریکه‌ی تێدابێ پێستمان زیپکه‌ی لێ دێ که زۆرتر له‌پێستی قه‌ساباندا ده‌بیندرێ. بۆیه پێی ده‌ڵێن"زیپکه‌ی قه‌سابان" چون له‌وانه‌یه ئه‌ونه‌خۆشی‌یه له‌و رێگایه‌را بڵاو بێته‌وه ده‌رمان بکرێ باشتره.

چوار هه‌تا هه‌شت حه‌وتوو دوای چوونی میکرۆب بۆنێو له‌ش نیشانه‌کانی ئه‌و نه‌خۆشی یه دیاری ده‌کرێ ئه‌و که‌سه‌ی ئه‌و نه‌خۆشی یه

بگرێ ئێواران سەریەشە دەگرێ و نۆبەتەی( یاو ) دێتێ کە لەبەر کەمهێزی هەست پێ ناکا و شەوانە لەکاتی خەودا ئارەقە دەکا و پاش ماوەیەک کز دەبێ بەیانان و لەکاتی کاری قورس دا دەکۆخێ. ئەو کۆخانە یەک یەک ویشکن بەلام لەپاشان تەڕ دەبن و هێندێک جار چڵک یا خوێنیان دەگەڵ دەبێ .

ئینسان لەکاتی وەرزش و کاری سووکیش قەلبی بە توندی لێدەدا .

ئەو کەسەی کە نەخۆشی ئازارەباریکەی گوارشی هەیە دڵ یەشە دەگرێ ولە پاشان ئیسهال دەبێ .هەر بەشێک لە لەش یاهەر دەزگایەک ئەو نەخۆشی یە بگرێ بە تەواوی کاری پێ ناکرێ کە ئاسەواری ئەو نەخۆشی یە لە ئینسانی کەمتر لە دە ساڵ یا لە تەمەنی ٢٠تا ٤٠ ساڵەدا زۆر بەرچاوە.

بەو ئازمایشانەی خوارەوە دەتوانین بزانین کە ئینسان ئەونەخۆشی یەی هەیە یان نا :

ئازمایشی خوێن: میز رادیۆگرافی وتوبرکولینا-- سیون.

لەپێشوودا ئەگەر کەسێک ئەو نەخۆشی یەی گرتبا چاک نەدەبۆوە ودەبا لە جێگایەکی دوور لە خەڵک بە تەنیایی بژی وتەنانەت نەیدەتوانی بچێتە لای ، ماڵ ومناڵی خۆی،بەلام ئێستا دەرمانیان بۆ دۆزیوەتەوە.

لەدەرمان کردن،گرینگتر ئەوەیە کە چۆن نەهێڵین ئەو نەخۆشی یە بگرینەوە؟

یەکەم ڕێگا دەرزی لێدانە ( واکسیناسیون). واکسینی ئازارەباریکە یە . ئێستا ئەو ڕۆژەی کە منداڵ لەنەخۆشخانە لەدایک دەبێ ئەودەرزیەی لێدەدرێ بەلام ئەگەر بێتوو منداڵ لەماڵێ لەدایک بێ دەبێ هەتا دەرۆژ واکسێنە بکرێ هەروەها هەرکەس لە هەر تەمەنێکدا پێویستە خۆی واکسینە بکا وئەگەرکەسێک لە بنەماڵەیەکدا ئەو ئازارە بگرێ ئەوانی دیکە دەبێ خۆیان تێست کەن بەلام ئەگەر منداڵ لەچوار ساڵ چووکتر دەماڵ دابێ دەبێ لانی کەم سێ مانگ دەرمان بکرێ. ئەو کەسانەی نەخۆشی ئازارە باریکەیان هەیە دەبێ لە فڕێدانی بەڵغەم و ئاوی زار خۆ بپارێزن و لە کاتی کۆخین دا دەسرە لە پێش زاریان رابگرن بۆ ئەوەی کە میکرۆبی ئەو نەخۆشی یە لە ولات بلاو نەکەنەوە.

خانەوادەکان بۆبەرگری لە گرتنەوەی ئەو نەخۆشی‌یە دەتوانن ئەو کارانە بکەن :

١- لەشیری پاستوریزە کەڵک وەرگرن .

٢- گۆشت زۆر بکوڵێنن

٣- ئەو شیرەی کە پاستوریزە نەبێ زۆری بکوڵێنن .

بەرپرسانی بێهداشتیش دەبێ ئەوخاڵانەی خوارەوە ڕەچاو بکەن :

١- رادەی بێهداشت بەرنەسەر( ولات بێهداشتی بکەن)

٢- خانووی بێهداشتی ساز بکەن .

٣- نەخۆشان لە نەخۆشخانە بخەن( بەستەری کەن)

٤- سەرباز وپەرستار و کرێکار وخوێندەوارو.... واکسێنە بکەن .

هەروەها بۆ پێشگیری لە گرتنەوەی ئەونەخۆشی یە دەبێ ئاژەڵیش واکسێنە بکرێ چون ئەو نەخۆشی یە پرمەترسی ترین نەخۆشی هاوبەشی نێوان ئینسان و ئاژەڵە .بەرپرسانی کوشتا*رگا دەبێ ئاگاداربن پێش ئەوەی ئیزنی کوشتنەوەی ئاژەڵ بدەن بەرگری واکسێنی ئازارە باریکەی ئەو ئاژەڵە چاو لێ بکەن وئەگەر بەرگری نەبێ زۆر بەوردی موعاینەی بکەن .

## دیاری

## مەتەل

مەرە کوێرە هەڵدەگرێ
دادەگەڕێ وهەڵدەبڕێ

" [illegible] "

دەست دەچاوی نێ
گوێ قوت دەکا

" [illegible] "

لە لایەک بەفرە
لە لایەک باران

" [illegible] "

لە دوور دێ
لە نزیک دێ
لەپردی سوور دێ

" [illegible] "

مانگی ئاداری
بەفر ببارێ
تا گەڵای دارێ
نامێنی تائیوارێ

" [illegible] "

# پەندی پێشینیان

پارە بەرەڤ کرن هێسانە خودان کرن دژوارە.

مالێ دنیایێ قرێجا دەستایە مێ پێ ل بەرخا خۆ ناکە

هرچ پیر دبن کودک پێ دکەنن.

مالێ نەبوو شیڤا شەڤێ بووکێ پەقلاوە دخاست.

بووکێ ئەز ژ تەڕامە خەسوویێ تو گوە لێ بە.

دەری ئەز ژ تەڕامە پشتەدەری تو ببهێ.

هەر کەری را ئاخوڕ چێ ناکەن.

ب گولەکێ بهار نایێ.

ب کەرێ نەشێ،ل کورتانێ دده (ب کەرێ نەوێرە ل کورتانێ شێرە)

تێژکێ مارا،بێ ژار نابن.

تیژکێ ماسیا ، ئاڤێ دا ناخەنقن.

تەیرێ شارەزا ب هەر دوو لنگا دکەڤە داڤێ.

ئینسان عەیبا خۆڤە کۆرە.

دۆ برایێ ماستی یە.

باغێ بێ پەرژین، کچا بێ دایین.

بارێ خارا، ناگێژەوارا.

بەر ل جێهی خوەدا سەنگە،
بەر ل جێهی خوەدا گرانە،
ئەگەر قلقلی نەبدوپەرانە،

شەواڵ ئەڕا سەردی وگەرمی نیە.

دوز ئەگەر بتوانی دوزی بکەی شەوار فرەیە.

عیسا وەدینی مووسی وەدینی.

قسەی حەق بکە هەرچەن تیەلە.

ئاسن سووێر وەپف سارد نیەود.

خودا پەنج کلک جوریەک خەلق نەکردیە.

دونیا جەنگەڵ مەولاس.

کێو وەکێو نیە تەتی ئایم وەئایم تەتی.

راس بێژی رەستگاری درو بیوشی گرفتاری.

کەس وە دو خۆی نەوشی تورش.

وە زمسان شەوێ وەپیران تەوێ.

تۆ میوە بخوە،وەداری چە ـ توای ؟

ئاویگ ریشیا جەما نیاود.

نانی کوت بی،دی یەکا نیەگری

سەرێگ ژان نیەکەی وەدەسماڵ نەوەس.

ددانێک ژان کەی بایس بکیشیدەی.

ئاشپەزگ بیە دوو گلە ئاش یا شوور بوو یا بی خوا.

راوانی بردنە جەئەم دەت، چیلگی تەرە.

## تامی مریشک

ئاغا روو لە نۆکەرەکەی دەکا ودەڵێ :
- حەمە بلێ بزانم مریشکی سوور کراوە کوێی خۆشە ؟
- قوربان ! گۆشتی باڵی خۆشە
- کوڕە جا چون ؟ بۆ لەجیات هەموو جێگایەک باڵ ؟ خۆ باڵ هیچ گۆشتی پێوە نیە !
- قوربان قەتم جێگای دیکە وەبەر نەکەوتووە تا بزانم خۆشە یا نا !

## فەرهەنگی کارمەند

یەخچاڵ: هەناسەساردی ماڵ
مەنجەڵ: رووسووری ماڵ
پشیلە : چاوەدێری ماڵ
خدری زیندە : میوانی بەدیاری
شەختە : میوانی نەخۆش
خۆرە : منداڵی ورد

## دوکتوری بەراستی

- ئەو پیرێژنە کەلاکە کێیە لەگەڵت؟
- ئەوە پوورمە! نەخۆشە دەیبەم بۆلای دوکتۆر.
- چیەتی ؟
- گوێی گران بووە. چاوی نابینێ . دەستی لەرزە.
- بەمێردی بدە چاک دەبێتەوە.
لەو دەمەدا ژنەکە سەر بەرز دەکاتەوە ودەڵێ :
- ئەو دوکتۆرە کێ بوو ؟

## نەخۆش

- جەنابی دوکتۆر بەقوربانت بم کوڕەکەم زۆر نەخۆشە !
- خانم دەبێ عەمەل بکرێ . بەرقیش نیە.
- دەی جا چ بوو! لە ماڵێ فانووسمان هەیە بچم بیهێنم ؟

## شەری هەستەیی

دوو تریاکی گێلاسیان دەخوارد و دەنکەکانیان پێک دادەدا .یەکێک هات لێی پرسین :
- ئەوە چیە ؟
- بکشێوە ! شەڕی هەستەیی یە !

## دەرس

دوو شاگردی تەوەزەل قسەیان دەکرد :
- بریا وەکی نووسراوە شتی فرۆشراو تازە وەرناگیرێتەوە، لە کلاسیش نووسرابا دەرسی گوتراو ناپرسرێتەوە!

## شەری تەن بەتەن

کوڕێک وەختی سەربازی هاتبوو، بردیان بۆ معاینە گوتی :
- جەنابی دوکتۆر من چاوم نزیک بینە !
- بەڵێ راست دەکەی نزیک بینە !
- ئەگەر وایە مەعاف دەبم ؟
- نا ... دەنووسم تۆ تەنیا بۆ شەڕی تەن بە تەن بەرن !

# فەرهەنگۆک

**سوختە :** پلەی - یەکەمی فەقێ یەتی ئەو فەقێ یە کە تازە دەستی بە خوێندن کردووە .

**مخابن:** ئەفسووس ، داخ ودەرد.

**نوالە:** هەرە ودۆل

**کەویە :** رنوو، بەفری بەسەریەکدا کەوتووی لاپاڵ ودۆڵ و دەرەی ، کوێستان.

**بەربینک گرتن:** بروبیانوو گرتن.

**دام قەلاشتە خوار:** بەرەوخــوار رۆیشتم .

**هێلکە ورۆن خۆر:** ئازدار وکار نەکردوو

**قەلەخوی:** فەلاح ، وەرزێر

**سەرجن کردن:** سـەری تـووتـن هەلپچراندن بۆئەوەی گەڵاکانـی قەوی تر بن .

**قەل فرکردن:** کۆچ کردنـی لـە ناچاری .

**قوونە کەو کردن:** گەڕان وتاقی کردنەوە .

**شامان بە سەپان نەدەزانی:** تێر و تەسەل بووین ونیازمان بـە کەس نەبوو! شامان بە نـوکـەر نەدەگرت .

**سووری سەرهەڵوەشێن:** (اسرار مگو) رازی نهێنی وسەر بە بادەر.

**رمێن:** برە و رەواج

**هاتمەوە سەر حوللەمەرەســـی :** گەڕامەوە سەر باری ئالەباری جاران . وەک خۆم لێهاتەوە . ( هەژار بوومەوە)

**مووەمە چەقەنەی ئاش :** هەدادانم نـەما . زۆر هەڵدەسوورام

**بەربینگ گرتن:** بڕوبیانوو گرتن

**پێخوست :** ژێر پێ

**بەر بۆ لایەک هەڵاوێم:** بچمــە شوێنێکی تر. لەجێگای خۆم نەمێنم.

**هازە:** دەنگی گوللەوسەماوەر

**کەڵەکەوان:** ئەو کەسە کـەڵـەک دێنێ و دەبا

**ئازارە باریکە:** نەخۆشی سیل

**ئاتەک ،** داوێن ،بەشی خوارەوە

**کوشتارگا :** قەساب خانە

**گەنج:** لاو ، جحێل

**مەکۆ:** ناوەند

**سامانداز:** دەوڵەمەند

**لەز:** پەلە

**چاران :** سازان

**تاقیکاری:** تاقی کردنەوە

**رچە:** رێگەشکاندن لەسەر بەفر

**کۆنەل :** نێوەراست

**کەڵەک :** چەندداری لێک بەستــوو بۆ پەڕینەوە .

**کۆڵوانە :** چارشێوشان

**شاگەشکە :** خەنی

**تەریق:** شەرمسار

**ئەوک :** قورگ ، گەروو

**لەخۆبایی:** بەفێز وئیفادە

**پەلاش:** زۆر وزەبەند

**غوراوی خەو:** شیرین خەو

**چاچی:** چاپەز

**چاچی:** کەوان

**بێ ئەنوا :** هەژار،بێ نەوا

**تۆژینەوە :** لێکۆڵینەوە

**تێداچوون :** فەوتان

**ئەندەرز:** نسحەت

**خۆلەقەرەدان :** تخوون کەوتن

**تەویل :** نێوچاوان ، هەنیە

**پرووش :** سیس

**تێزان ;** قەتیس مان

**تاسکڵاو:** کڵاوی ژنی قەدیم کە زێر وزەمبەریان پێوە هەڵداوەسی

**دەرهەڵبوون :** تووڕە بوون

**پێ هەڵکاڵان:** دوعای خراپ کردن

**تاتی:** لباد

**هەنیە :** نێوچاوان

**لاسار :** قۆشمە ،سەرەڕۆ ،

**زگ سووتان:** منداڵ مردن

**تۆلاس:** لاوی کەللە پڕ

**لەبن هێنان:** لەنێو بردن

**قولۆز:** بلیند، بەرز

**ئۆرتە :** نیڤەک ، نێوان

**پێچی :** پێچک ،تلی،تپل،قامک

**تەپ :** کۆپ ، چەپۆک

**بەنگزی:** مەسخەرە ، قەشمەری

**ئێپێچە :** زۆر، گەلەک

**دەمنی :** پشپشی ،تەژی بوو، پێش خواردنەوە

**هێرس :** تووڕە، پەرت

**کنج :** جل وبەرگ

**تمتێل:** (سرووضع)تەمتێل، سەر و سەکوت

**دنێ:** دن،دی، دیکە(دنیا )

**زەعف :** زۆر، گەلەک

**گۆم :** کۆڤ ،هەل ،هۆل

**وەرمین:** پەرچڤین ، ماسین

**هەستوو:** هەستی ، ئێسک

**جوومسوون:** نوقمبوون

**مێژوو:** دیرۆک ،تاریخ

**ئاران:** گەرمیان،گەرمستان

**لێکۆڵ:** موجەقیق،لێکولینەر

**پاشکۆ :** پاشبەند،پاشوەند

**پەیڤ :** گۆتە ، وشە

**ئادەکی:** وەکی ئادەیـــا وەک جزیرەیـــا

**گرنگ :** گرینگ،بەربچاڤ

**دەب :** داب ،رێ وشوون

**مێژین :** بەرین، قەدیمی

**کاڤل:** وێران،خۆپان،خاپوور

**هەرئوسا :** هــە رووەتو ،هــەرووەرنگ هەرووەهـــا

**هێڤاستن:** چنینەوەی جل وبەرگ و گورەوی دراو

**کوس‌کوساندن:** کسکە کسکی چاوان

**قۆر:** لاواز،ژار،لەغەر، لەر

**چێلک :** دەرزی یامەزن،تەبەنە .

**توومک :** توونجک ،پۆرک ،(شەرەف ) کاکول

**هەڤووفرێت :** تارووبو

**سۆلدەر:** سێدەر، کەوشکەن .

**هێڤرزە :** قەرەبالغ ،قالمەقال

**هەلوەستا :** رابوو، هەستا

**هەلەپەلە :** لەزوبەز، بەپەلە

**قورانە :** ریسمەی دەرک

**پۆنژین:** بیرکردنەوەی شێواو

**پێگەرمۆک :** پیاسە

کری کوردی خوراسان
دیاری کەلیموللا تەوەحودی

سەقز: محەممەد باژیان

ڕووبار
مەهاباد: خالیدئیسماعیلی

تەقەدار
بۆکان: یۆسف عەسکەری

گوندی کیسەڵاوێ
شنۆ: تاهیر ڕوستایی